ناڤێ پەرتوکێ : گەڕیانەك بۆ ناڤ لەشێ مروڤی

دانان : کارولینا بێنگام

دیزاینا چاپا ڕەسەن : جێس بێنتاڵ

وێنەکێشان : لیسا سویرلینگ و ڕالف لازار

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی : دیان جەمیل

تیپچن : کاژین جەمیل

دیزاینا چاپا کوردی : بێوار محەمەد

قەبارە : 21.5سم X 27.5سم

ژمارا لاپەران : 64 لاپەر

تیراژ : 500 دانە

نرخ : 5000 دینار














# گەڕیانەك
# بۆ ناڤ لەشێ مرۆڤی

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

**دیان جەمیل**



# ... ناڤەرۆك ...

تیبینی

بۆ هندێ تو پتر مفای ژ ڤێ پەرتوکێ وەربگری. ئەڤ ئەکتەرێن کارتونی دێ ب درێژاهیا پەرتوکێ دگەل تە بن. هەر جهێ تو مایە ئاسێ یان تو بابەتەکی تێنەگەهستی تەماشەی وان بکەچونکی ئەو ب لڤینێن خۆ یێن جوان و سەرنج ڕاکێش دێ وی بابەتی بۆ تە پتر ڕۆهن کەن. لێ ل دەست پێکێ دڤێت تو هەڤنیاسینێ دگەل وان بکەی و ب بنیاسی



هێژا بەرین ماب و پوپ یێن پاقژکەر بوبی یێ زارووک د. داڤید



جۆنێ ب هێز نێدی کەیفخۆش ستیڤێ نڤستی هاری یێ بەرزە. سیکویێ مەندەهوش

# لەشێ مروڤی ژ چ پێکدهێت ؟

لەشێ هەر مروڤەکی پێکدهێت ژ دوو پێ، دوو دەست، دوو چاڤ، دفنەك .... هتد. ئەڤ سیفەتێن تایبەتمەند مروڤی ژ گشت زیندەوەرێن دی یێن ل سەر رۆیێ ئەردی جودا دکەن. هەردیسان هەر مروڤەکی ب خۆژی هندەك تایبەتمەندی هەنە کو وەکی یێن کەسێ نینن. تو هەڤالێن خۆ ب رێکا دەنگ و سەروچاڤێن وان د نیاسی.

ب گشتی سیستەمێن لەشێ هەمی مروڤان وەکی ئێکن، لێ رۆخسارێ وان یێ ژ دەرڤە یێ ژێکجودایە.

## بوچی ئەم وەکی ئێک نینین ؟

چاڤێن هندەك مروڤان د شینن، یێن هندەکان د رەشن و یێن هندەکێن دی د قەهوائینە. هەردیسان پرچا هندەکان یا رەشە و یا هندەکان یا زەرە. رەنگێ پرچێ و چاڤان و دێمی هندەك سیفەتن هاریکاریا مە دکەن ئەم وەکی ئێک نەبین.

## هندەك راستی دەربارەی مروڤان

- هژمارا مروڤان ل سەر رۆیێ ئەردی گەهشتیە حەفت ملیار مروڤان.
- مروڤێن ل سەر رۆیێ ئەردی ب شەش هزار و پێنج سەد زمانان د ئاخڤن.
- هندەك سیفەتێن تایبەت وەك رەنگێ سەروچاڤان و رەنگێ پرچێ ژ دەیکوبابان بۆ مە دهێنە ڤەگوهاستن.
- نێزیکی سێ چارێکا لەشێ مروڤی ژ ئاڤێ پێک دهێت.
- نیڤەکا خانەیێن لەشێ مروڤی تەپکێن خوونێ نە.

## تایبەتمەندیێن تە چنە ؟

هەر مروڤەکی هندەك سیفەتێن تایبەت هەنە و وەکی یێن کەسێ نینن وەك شوینتبلا دەستی و ڕەشرەشکا چاڤی. ئەڤ سیفەتە ل سەر تشتەکێ بچوك دناڤ لەشیدا دهێنە هەلگرتن د بێژنێ DNA کو ئەو بڕیارێ ددەت کا لەشێ مە یێ چەوا بیت.

## سیستەمێن لەشێ مە چەندن ؟

لەشێ مروڤی بۆ سەر چەند سیستەمان دهێتە دابەشکرن. و هەر ئێک کارەکێ تایبەت ئەنجام ددەت. سیستەم هەمی پێکڤە هاریکاریا ئێک و دوو دکەن. دەمێ ئەو ب دروستاهی کار بکەن لەشێ مروڤی یێ ساخلەمە. لێ هەما وان کارێ خۆ باش نەکر مروڤ دێ نەساخ بیت.

## مروڤی بونەوەرەکێ شیردەرە

مروڤ ژ نشێ گیانەوەرێن شیردەرە. ئەم پێدڤی ب هەواینە بۆ هەناسەدانێ و پێدڤی ب خوارنێ و ئاڤێنە بۆ ب دەستڤە ئینانا تێهنێ و هێزێ. ئەم دهێنە هژمارتن شیردەر چونکی زارویێن مە دەما هێشتا د بچوك شیرێ دەیکا خۆ دخون هەتا پێ مەزن د بن.

## بوچی زارۆیێن جێمک وەکی ئێکن ؟

هندەك زارو هەنە جێمکن و گەلەك وەکی ئێکن. دبیت هندەك جاران یا ب زەحمەت بیت مروڤ وان ژێک جودابکەت. چونکی ئەو هەردوو پێکڤە یێ ژ هێکەکێ دروست بوین و پێکڤە ژدایک دبن.

زارویێن جێمک گەلەك وەکی ئێکن. لێ هەر ئێکی شوینتبلا خۆ یا تایبەت هەیە.

## خانە... شانە... ئەندام

ئەرێ تو دزانی لەشێ مە ژ چ پێکدهێت ؟

لەشێ مە ژ هندەك گەردێن بچوك یێن ئوکسجین، کاربۆن، هایدرۆجین، نایترۆجین، کالسیوم و فۆسفاتی پێکدهێت، زێدەباری گەلەك تۆخمێن دی یێن کیمیایی. ئەڤ تۆخمە پێکڤە د هێنە گرێدان و لەشێ مە دروست دکەن.

### بلوکێن ئاڤاکرنا لەشی

کا چەوا ئاڤاهی ژ بلوکان د هێنە دروست کرن، لەشێ مەژی ژ هندەك بلوکان هاتیە دروست کرن د بێژنێ خانە. گەلەك جورێن خانەیان دناڤ لەشیدا هەنە، وەك خانەیێن دوهنی، خانەیێن پیستی، خانەیێن دەماران، خانەیێن خوونێ و گەلەکێن دی. ئەڤ خانەیە شانەیێن خوونێ و هەستیکان و زەڤلەکان دروست دکەن.



بۆریا خوونێ دناڤ مێلاکا سۆردا





دناڤ خانەێن لەشیدا ناڤکەك هەیە ، ناڤک جهێ بڕیاردانێ یە

### ژ شانەیان بەرەڤ ئەنداماان

خانەیێن وەکهەڤ پێکڤە د هێنە کومکرن بۆ دروست کرنا شانەیەکێ، جورەکێ شانەیێن وەکی ئێک، یانژی دوو جورێن شانەیێن ژێکجودا پێکڤە ئەندامەکێ دروست دکەن. دل ئەندامە، مێلاك ئەندامە، چاڤ ئەندامە. هەر ئەندامەکێ لەشێ مروڤی ژی کارەکێ تایبەت ئەنجام ددەت.

د لەشێ مەدا پتر ژ بلیۆن خانەیان هەنە و
هەمیان خوارن و ئوکسجین دڤێت داکو
ب مینە ساخ

## ئەندام چ کار دکەن ؟

ئەندامێن لەشی مە هەر ئێک کاری خۆ ب
رەنگەکێ دروست ئەنجام ددەت داکو مروڤ ب
مینتە ساخ. هەردیسان هندەك ئەندام پێکڤە
کار دکەن و سیستەمەکی پێک د ئینن. بۆ
نموونە ئەزمان، دفن، گەوری، خرخرك، بۆریا
هەوایی و مێلاکێن سۆر هندەك ئەندامن پێکڤە
سیستەمێ هەناسەدانێ پێک د ئینن.



گەلەك جورێن خانەیان هەنە

## دەمێ تو سەحدکەیە خانەیان، تو چ د بینی ؟

شێوێ خانەیان د ژێکجودانە لەورا کارێ وان ژی وەکی
ئێک نینە. خانەیێن دەماران د درێژن و چەق ژێڤە دبن.
خانەیێن دوهنی د مەزن و تژینە. تەپکێن سۆر یێن خوونێ
د کوورن. پتریا خانەیان سەنتەرەك هەیە دبێژنێ ناڤک
کو کونترۆلێ ل سەر کارێ خانێ دکەت (تەپکێن سۆر
یێن خوونێ ناڤک نینە). هەردیسان گەلەك تشتێن دی
یێن بچوك دناڤ خانێدا هەنە.

خانەیێن خوونێ



خانەیێن دوهنی



خانەیێن دەماران



## بوچی هەستیک دناڤ لەشێ مەدا هەنە ؟

پەیکەرێ هەستیکان چارچوڤەکێ ب هێز بۆ لەشێ مروڤی پەیدا دکەت. زێدەباری پاراستنا ئەندامێن دی یێن لەشی وەك دلی و مێلاك و ڕیشیکان. دوو سەد و شەش هەستیک دناڤ لەشێدا مەدا هەنە و هەمی ب ڕێکا گەهان پێکڤە هاتینە گرێدان. هەردیسان هەستیک ب زەڤلەکانڤە د هێنە گرێدان و هاریکاریا مە دکەن ئەم ب ڕێڤە بچین. زێدەباری دروست کرنا خانەیێن خوونێ.

### بوچی ئەم بونەوەرێن بڕبڕدارین ؟

مروڤ بونەوەرەکێ بڕبڕدارە. چونکی بڕبڕە د ناڤ پشتا ویدا هەنە. بڕبڕە ژ 24هەستیکێن ژێکجودا پێک دهێن زێدەباری کەلێژیا پشتێ. هەردیسان مادەیەکێ وەکی جێلیێ و هندەك شانەیێن نەرم وەکی بالیفکان کو دبێژنێ گەهـ ل بن سەرێ هەستیکان هاتینە دانان داکو بڕبڕە ل سەر ئێک نەخڕێن.

زارووێن ساڤا پتر هەستیک ژ کەسێن مەزن هەنە. لێ دەمێ ئەوژێ مەزن د بن هندەك هەستیکێن وان د بنە ئێک

بڕبڕە

کڕکڕك

چارێکەکا هەستیکێن لەشی دناڤ دەستان دانە. هەر دەستەکێ هەستیک هەنە

## ئەرێ جارەكێ دەستێ تە شكەستیە ؟

دەمێ هەستیكێن دەست و پێن مروڤی د شكێن. ئەو ب خۆ دێ خۆ دروست كەنەڤە. لێ ئەو پێدڤی ب هاریكاریا مەنە. لەورا نوژدار دێ پلاستەرەكێ دانیتە سەر جهێ شكەستی داكو هەستیك باش ب كەڤنە جهێ خۆ هەتا خۆ جارەكا دی دروست د كەنەڤە.

هەتا شەش حەفتی پێن دی

هەتا كەنگی پێ من دێ ساخ بیت ؟

## كارگەها دروست كرنا خوونێ

هندەك هەستیك د هێنە هژمارتن كارگەهێن دروست كرنا خوونێ. د نیڤەكا ڤان هەستیكان دا مەژی هەیە كو تەپكێن سۆر یێن خوونێ و هندەك تەپكێن سپی یێن خوونێ بەرهەم د ئینن.

هەستیكێ ڕانی

هەستیكێ ڕەق

هەستیكێ ئیسفەنجی

## د ناڤ هەستیكان دا كەلەك ڤالاهی هەنە

هندەك جورێن هەستیكان ب تایبەت هەستیكێن ڕاهنی تەخەكا وەكی ئیسفەنجی هەیە و ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر هەردوو سەرێن وی مەزن و گرۆڤر خۆیا بكەن. لێ هەستیكێن ب هێز د پرن ژ بۆرییێن خوونێ، دەماران و خانەیێن هەستیكان.



# چەوا هەستیێک پێکڤە د هێنە گرێدان ؟



دەمێ تو پێن خۆ یان دەستێن خۆ ب کڤێشی، دبیت هەستیکێن لەشێ تە کەلەک رِەق بن. لێ دناڤ لەشیدا نێزیکی 400 گەهان هەنە ڤان هەستیکان پێکڤە گرێدەن و وەلێ دکەن ب سانەهی ب لڤلڤن. دناڤ دەستێ تە بتنێ دا 19 گەهێن لڤوك هەنە. لەورا ب سانەهی تو دشێی تبلێن خۆ ب لڤینی و تشتان پێ بگری.



## گەه چنە ؟

گەه ئەو خالە یا دوو هەستیێک یان پتر لێ دگەهنە ئێک و پێکڤە د هێنە گرێدان. گەلەك جورێن گەهان هەنە و هەر ئێک ژی کارەکێ تایبەت ئەنجام ددەت. پتریا گەهان کارێ وان لڤاندنا هەستیکانە. لێ هندەك د جێگیرن و نالڤلڤن.






## جورێن گەهان

گەها دکەڤیتە دەڤەرا حەڤزا مروڤی ژ جورێ قوفل و کلیلێ یە. ئانکو هەستیکێن رِانی وەکی کلیلکەکێ نە و حەڤز ژی وەکی قوفلەکێ یە. هەردیسان گەهێن هەردوو ملان ژی ژ جورێ قوفل و کلیلێ نە.



## چەوا گەه د هێنە پاراستن ؟

دەمێ دەرگەه چیر چیرێ د کەت مروڤ دێ زەیتەکێ کەتە سەر داکو نەرم بیت و ڤی دەنگێ نەخۆش نەکەت. هەروەسا ماددەیەکێ شل وەکی زەیتێ هەیە د بیژنێ شلەیێ سینوڤی ناهێلیت چیر چیر ژ گەهان بهێت دەمێ د لڤلڤن.

ئەگەر گەه دناڤبەرا هەستیکێن لەشێ مروڤیدا نەبان، مروڤ نەدشیا چ کاران ئەنجام بدەت





## هندەك گەهـ بۆ لایەكی بتنێ د زڤڕن

گەهێن سەرێ چوكان بتنێ بۆ لایەكی د زڤڕن. ئانكو تو دشێی چوكێن خۆ بۆ لایێ پشتێ خوار بكەی. لێ قەت تو نەشێی بۆ لایێ سینگی خوار بكەی. هەر وەكی دەرگەهێ ژورێ ب تنێ تو دشێی بۆ ناڤدا بینی لێ تو نەشێی بەیە لایێ ژ دەرڤە.



## گەهێن قەڕقۆدێ سەری مروڤی

قەڕقۆدێ سەرێ مروڤی ژ 22هەستیكێن ژێكڤەبووی پێک دهێت. لێ ئەڤ هەستیكە ب ڕێكا هندەك گەهێن نەلڤوك ب شێوەیەكێ ب هێز پێكڤە هاتینە گرێدان. د بێژنە گەهێن قەڕقۆدەی دەرز.



هەستیكێن پەحنكا پێ مروڤی ب هاریكا شانەیێن وەكی لاستیكان پێكڤە د هێنە گرێدان.

## لاستیک

گەهـ ب هاریكاریا هندەك دەرزییان پێكڤە د هێنە گرێدان د بێژنێ لاستیک. ئەڤ لاستیكە پیچەكێ ژێک د هێنە كێشان و هەستیكان پێكڤە گرێدەن. لاستیک گەهان ب هەستیكانڤە گرێدەن لێ كارتێكرنێ ل لڤینا وان ناكەت. گەلەك جاران لاستیک دێ دڕیێن ئەوژی ژ ئەنجامێ جهچوونا گەهان ژبەر ڤێ چەندێ یا پێدڤیە گەهـ بچنە جهێ خۆ یێ دروست داكو لاستیک ژی ساخ بنەڤە.



دەست ئێكە ژ لڤوكترین گەهێن لەشێ مروڤی

# بوچی زەڤلەك دناڤ لەشێ مەدا هەنە ؟

ئەو چ تشتە هاریكاریا تە دكەت دەمێ تو ب رێڤە دچی ؟ چ پێنەڤێت ئەو زەڤلەكن ب هاریكاریا زەڤلەكان تو دشێی بكەیە غار و خۆ بلند بكەی. هەردیسان هاریكاریا تە دكەن بێهنا خۆ ب هەلكێشی و بكەیە كەنی و سترانان بێژی. وەرن دا پێكڤە سەحكەینێ كا چەوا زەڤلەك كارێ خۆ ئەنجام ددەن.

## هندەك زەڤلەك یێ ل ژێر كونترۆلا مروڤی

هندەك زەڤلەك بێ دەستوریا مروڤی كار دكەن، ئانكو مروڤی ئاگەهـ ژێ نینە. زەڤلەكێن دلی چ دەمێ مروڤ یێ هشیاربیت یان یێ نڤستی خۆ بەردەوام د قوتن. لێ زەڤلەكێن دی ل دووڤ بڕیارێن مروڤی كار دكەن، ئانكو تو فەرمانێ دەیێ كا چەوا كار بكەن.

ئەزمانی 16 زەڤلەكان یێن هەین

## شێوێ زەڤلەكان یێ چەوایە ؟

زەڤلەكێن حلی : شێوێ وان یێ كورتە و دوماهیكا وان یا خالداره. ئەڤ زەڤلەكە هاریكاریا لڤاندنا خوارنێ د ناڤ ڕیڤیكاندا دكەن.

زەڤلەكێن دلی ئەڤ زەڤلەكە وەكی دەرزیانە و د درێژن. ئەڤ زەڤلەكە خۆ د قوتن داكو دل بشێت خوونێ فرێكەتە هەمی پارچەیێن لەشی.

زەڤلەكێن پەیكەری : ئەڤ زەڤلەكەژی د درێژن و ل سەر هەستیكان هاتینە دانان داكو مروڤ بشێت دەست و پێن خۆ ب لڤینیت

### بۆ ڕاستکرنا دەستی




### بۆ چەماندنا دەستی




## زەڤلەك چەوا كار دكەن ؟



زەڤەکێن پەیکەری کارێ خۆ دکەن دەما مێشک بێژیتە وان ڕەق بن (زەڤلەك دێ کورت و پەحن بن). ئەڤ ڕەقبونە دێ بیتە ئەگەر زەڤلەك ل سەر هەستیکان بهێنە راکێشان. زەڤلەکێن پەیکەری ب شێوێ جووت کار دکەن. بۆ نموونە دناڤ دەستێ تەدا. زەڤلەکا دووسەر دەستی د چەمینیت و زەڤلەکا سێ سەر دەستی ڕاست دکەت.

نێزیکی 650زەڤلەکان ل دورماندور هەستیکێن لەشی هاتینە پێچان



## زەڤلەك گەرماتیێ بەرهەم د ئینن



زەڤلەکێن پەیکەری دەما کار دکەن گەرماتیێ بەرهەم د ئینن. ژبەر ڤێ چەندێ خوێ لەشێ تە د گریت دەما تو دکەیە غار ئەگەر خۆ دنیا یا سارژی بیت.



## چەوا زەڤلەك ب هەستیکانڤە د هێنە گرێدان؟

زەڤلەك ب ڕێکا هندەك شانەیێن وەکی وەریسکا ب هەستیکانڤە د هێنە گرێدان دبێژنێ ژەهک. هەروەکی کا چەوا کەهـ ژی ب هاریکاریا لاستیکان پێکڤە د هێنە گرێدان.

# چەوا ئەم هزرا خۆ د کەین ؟



ئەرێ تو چەوا هزرا خۆ د تشتاندا د کەی و بیرا خو لێ د ئینیەڤە، چەوا فێر دبی، چەوا هەست ب تشتان دکەی، چەوا دێ پلانەکێ بۆ خۆ دانی بۆ کار کرنێ ؟ بۆ ئەنجامدانا ڤان کاران هەمیان تو مێشکێ خۆ ب کار د ئینی. مێشک شانەیەکا وەکی ئیسفەنجیە و ژ بلیۆنەها خانەیێن دەماری پێکدهێت د بێژنێ نیرون.

پارچا مەژی یا راستێ کونترۆلێ ل سەر لایێ چەپێ یێ لەشی دکەت و سەرەدەریێ دگەل بابەتێن هونەری و مۆزیکێ دکەت.

پارچا مەژی یا چەپێ کونترۆلێ ل سەر لایێ راستێ یێ لەشی دکەت و سەرەدەریێ دگەل بابەتێن زمانی و بیرکاریێ دکەت.

## مەژی یێ چەوایە ؟

مەژی سەنتەرێ کونترۆل کرنێ یە دناڤ لەشێ مروڤیدا. مەژی بارستەیەکا شانەیی یا وەرپێچایە و هاتیە دابەشکرن بۆ دوو پارچەیێن پێکڤە گرێدای. هەر پارچەیەک کونترۆلێ ل سەر لایەکێ لەشی دکەت.



## ڤی کاری بکە " کارێ هە بکە

تەخا دەرەکی یا مەژی د بێژنێ بەرگێ مەژی و هاتیە دابەشکرن بۆ سەر چەند دەڤەرەکان کو هاریکاریا مە دکەت هندەک کارێن دەست نیشانکری بکەین. دەڤەرا هەستکرنێ هەیە کو پەیامان ژ پیستی وەردگریت. دەڤەرا لڤینێ فەرمانێ ل زەڤلەکان دکەت ب لڤلڤن.

مێشکوکە ژ مێشکی بچۆکترە و هاریکاریا مروڤی دکەت بۆ لڤین و خۆ کونجاندنێ

## نیرۆن

تەوەر نامەیان بۆ خانەیێن دی یێن نیرۆنان ڤەدگوهێزیت

لەشێ خانێ

دبێژنە خانەیێن مەژی نیرۆن

نامە ب هاریکاریا چەقان ژ خانەیێن دی یێن نیرۆنان دهێنە دناڤ خانەیا نیرۆنێ دا

مەژی نێزیکی 100 بلیۆن خانەیێن نیرۆنان هەنە

### هێماییێن کارەبایی

خانەیێن نیرۆنان یێن کو مەژی پێک د ئینن، پێزانینان ژ خانەیەکێ بۆ ئێکا دی ل سەر شێوێ هێماییێن کارەبایی ڤەدگوهێزن. هەتا ئەگەر تو یێ نڤستی ژی ژی ئەڤ هێمایە بەردەوام د هێنە هنارتن.

دیتن

بێهنکرن

دەستکرن

تامکرن

### ب کارئینانا هەستان

هەستێن مە پشت بەستنێ د کەنە سەر خانەیێن دەماران بۆ گەهاندن و ژێ وەرگرتنا نامەیان بۆ مەژی. بۆ نموونە ئەو هاریکاریا لڤینا زەڤلەکێن دەستی دکەن تاکو مروڤ بشێت ڤێقی پێ بگریت و بشێت بخۆت.



# بوچی دەمار د ناڤ لەشێ مەدا هەنە ؟



مێشکێ مروڤی ب رێکا سیستەمێ دەماران پەیوەندیێ ب هەمی ئەندامێن لەشی دکەت. ئەڤ سیستەمە تورەکا خانەیێن دەمارانە و دگەهنە هەمی پارچێن لەشی. ئەڤ چەندە هندێ د گەهینیت کو مێشک کونترۆلێ ل سەر هەمی وان کاران دکەت یێن مروڤ ئەنجام ددەت.



ئەگەر خانەیێن دەمارێن لەشێ مە پێکڤە بهێنە گرێدان، درێژاهیا وان دێ گەهیتە 150 هزار کیلۆمەتران

مێشک ب وەریسکێ پشتێ ڤە د هێتە گرێدان

وەریسکێ پشتێ دناڤبەرا بربرێن پشتێ دا دهێتە پاراستن

دبیت درێژاهیا هندەک خانەیێن دەماران بگەهیتە مەترەکێ





## پەیوەندیکرن ب شێوەیەکێ بلەز

سیستەمێ دەماران ژ خانەیێن دەماری پێک دهێت کو زنجیرەیێن درێژ دروست دکەت. ئەڤ خانەیە پێکڤە کار دکەن و هەرئێک پەیامان دگەهینتە خانەیا ب رەخ خوڤە تا دگەهینتە مێشکی ئەوژی ب رێکا وەریسکێ پشتێ. ئەڤ پەیامە ب شێوەیەکێ گەلەک ب لەز دگەهنە دەماران.



سیستەمێ دەماران بەردەوام پەیامان
دگەهینتە مێشکی. دهەر چرکەکێدا
ب سەدەها پەیام دگەهنە مێشکی



## چەوا ئەم هەست ب گەرماتییێ دکەین ؟

دواهیا دەماران دگەهیتە سەر پیستی و بەورپرسیارن ژ هەستکرن ب گەرماتی و ئێشانێ. هندەک دەمار ژی بەرسڤا هندەک پەیامێن دی ددەن. بۆ نموونە دەمارا مێرکل بەرپرسیارە ژ هەستا دەستکرنێ.



## هندەک جاران
## ئەم گوهێ خۆ نادەینە مەژی

مروڤ هندەک کاران ب شێوێ ئوتۆماتیکی دکەت ئانکو ئەم پێدڤی نابین پرسیارێ ژ مێشکی خۆ بکەین. د بێژنە ڤێ چەندێ کارێ رەنگڤەدانێ. وەکی باوەشکدان و پژمین و نقاندنا چاڤان. بۆ ڤێ چەندێ ئەم پێدڤی ب بریارا مێشکی نابین. بۆ نموونە دەما دەرزیکەک بچیتە دەستێ تەرا ئێکسەر دێ دەستێ خۆ ڤەکێشی بەری هزرا خۆ بکەی کا ئەو چبوو چویە دەستێ تەرا.





## وەریسکێ پشتێ

وەریسکەکێ خانەیێن دەماران ژ مێشکی درێژ دبیت و دناڤ بۆریا بربرێن پشتێ را دەرباز دبیت دبێژنێ وەریسکێ پشتێ. ئەڤ وەریسکە رێکا سەرەکیە بۆ ڤەگوهاستنا پەیامان بۆ مێشکێ.



# بوچی مه دل هەیه ؟

دەستێ خۆ ب دانه سەر لایێ چەپێ یێ سینگێ خۆ. ئێکسەر دێ هەست ب لێدانێن دلێ خۆ کەی. رۆژانه دلێ ته نێزیکی 100 هزار جاران خۆ د قوتیت. دل بەردەوام خۆ د قوتیت داکو خوونێ ب گەهینته هەمی ئەندامێن لەشی.

## دل ژ چ پێکدهێت ؟

دلی دوو لا یێن هەین. هەر لایەکی ژی دوو ژور یێن هەین. لایێ سەری یێ بچوکه دبێژنێ ئەتریەم. لایێ خوارێ مەزنتره دبێژنێ ڤێنتریک. لایێ ڕاستێ خوونا بێ ئوکسجین فرێ دکەته هەردوو مێلاکێن سۆر. لایێ چەپێ خوونا ب ئوکسجین فرێ دکەته هەمی پارچەیێن لەشی.




## بوچی خوون پاشڤه نازڤڕیت ؟

دەمێ خوون ب ڕێکا خوونبەران ژ دلی دەردکەڤیت، پاشڤه نازڤڕیت، چونکی هندەك ئەزمانک (یانژی قەباغک) یێن دناڤ ڤان بۆریاندا کو ناهێلن خوون بەرەڤ پاشڤه ب زڤڕیت.

## هندەك ڕاستی دەربارەی دلی

- د هەر خۆلەکەکێدا دلێ زاروویان 85 جاران خۆ د قوتیت.
- دل دکەڤیته لایێ چەپێ یێ سینگێ مروڤی و پیچەکێ یێ خواره.
- زەڤلەکێن دلی ڕاستەوخۆ ب ڕێکا خوونبەرەکا تایبەت خوارنێ و ئوکسجینی ژ دلی وەردگرن.

ژبەرکو دلێ زاروویان یێ بچوکه لەورا پتر دشێت خۆ ب قوتیت

بوچی دلێ زاروویان پتر ژ دلێ مەزنان خۆ د قوتیت ؟

## کی قەباغکێن دلی د پارێزیت ؟

وەریسکەکێ بهێز کو د بێژنێ دەزوویێن دلی، قاباغکێن دلی یێن دناڤبەرا ئەترِیەم و ڤێنترِیکێدا د پارێزیت. دەمێ ڤێنترِیک خۆ د قوتیت دەزوویێن دلی ناهێلن ئەڤ قەباغکە بەروڤاژی بن.

قەبارێ دلێ تە هندی دەستێ
تەیە دەمێ تو دەستێ خۆ دکری



شاخوونبەر
مەزنترین بۆریا خوونێ یە دناڤ لەشیدا

بەرەڤ مێلاکا سۆر یا چەپێ

بەرەڤ مێلاکا سۆر یا راستێ

### دەما راهێنانان دکەی چ ل تە دهێت ؟

ئەرێ تە تیبینی کریە دەما تو راهێنانێن وەرزشی دکەی دلێ تە خۆ بلەزتر د قوتیت ؟ ژبەرکو لەش پێدڤی ب پتر خوونێ هەیە داکو گەلەك ئۆکسجین ب گەهیتە زەڤلەکان.

ئەتریەما
راستێ

قەباغک

ناڤبر

ڤێنترِیکا چەپێ



## چەوا خوون دگەهیتە ئەندامێن لەشی ؟

هزرا خۆ د خوونبەر و خوونزڤرۆکێن لەشێ خۆدا بکە. دەما دل خۆ د قوتیت خوونا پڕی ئوکسجین و خوارن ب ڕێکا زنجیرەکا خوونبەران فرێ دکەتە ناڤ لەشی. خوونزڤرۆك ژی زنجیرەکا بۆریانە خوونا پیس ژ لەشی کوم دکەت و د زڤرینتە ناڤ دلی.

### بوچی دل گەلەك خوونێ بۆ مەژی فرێدکەت ؟

نێزیکی 20٪ ژ وێ خوونا دل پالددەت دچیتە مەژی، مەژی کونترۆلێ ل سەر هەمی کارێن لەشێ مروڤی دکەت لەورا ئەو پێدڤی ب گەلەك خوونا ب ئوکسجینی هەیە بۆ ب جهئینانا ڤی کارێ مەزن.

## تو دشێی لێدانێن دلێ خو ب هەژمێری

دەمێ دلێ تە خۆ د قوتیت، لێدانەکێ ب ڕێکا خوونبەری فرێ دکەتە ناڤ دەستێ تە. تبلا خۆ ب دانە سەر خوونبەرا دەستێ خۆ یێ ڕاستێ (لایێ ژناڤدا). وێ کاڤێ دێ هەست ب لێدانێن دلێ خۆ کەی

## خوونبەر، خوونزڤرۆك، بۆریکێن خوونێ

❖ خوونبەران دیوارەکێ ستوور و چەندین تەخێن زەڤلەکان و شانەیێن لاستیکی هەنە.

❖ خوونزڤرۆکان دیوارەکێ تەنکتر هەیە. هەردیسان قەباغێک ژێ پێڤە هەنە داکو خوون پاشڤە نەزڤریت. ئەڤ بۆریە خوونێ د زڤرینەڤە بۆ ناڤ دلی.

❖ بۆریکێن خوونێ هندەك بۆریێن وەکی موویانە و خانەیێن خوونێ ئێک ل پشت ئێکێ تێرا دبورن. ئەڤ بۆریکە دگەهنە خوونزڤرۆکان لەورا دشێن ئوکسجین و خوارنێ ب گەهینە شانەیان و پاشەرۆکێن شانەیان کوم بکەن و ب گەهینە خوونزڤرۆکان.

## چ دناڤ خوونێ دا هەیە ؟

هزربکە سیستەمێ زڤرۆکا خوونێ وەکی ڕێکەکێ یە کو گەلەک چەق ژێ دچن. هەروەسا هزر بکە تەپکێن سۆر یێن خوونێ ژی وەکی لوریانە و یا پری خوارن و ئوکسجینە و دناڤ ڤان ڕێکان ڕا دبورن تا دگەهنە جهێ خو.

### خوون ژ چ پێکدهێت ؟

ئەگەر تو لیترەکا خوونێ وەربگری، پتر ژ نیڤەکێ وێ شلەیەکێ رۆهنە د بێژنێ پلازما. نیڤا دیژی تەپکێن سۆر یێن خوونێ نە. نێزیکی ٪1 ژی تەپکێن سپینە. هەردیسان هندەك پارچەیێن خانەیان تێدا هەنە د بێژنێ پەڕێن خوونێ.

### تەپکێن سپی

تەپکێن سپی یێن خوونێ شەرێ نەخۆشیان دکەن. چەندین جورێن ڤان خانەیان هەنە چونکی ل سەر وان پێدڤیە شەرێ گەلەك میکرۆبان بکەن ئەڤێن دڤێن نەخۆشیان بۆ مە پەیدا بکەن.

## تەپکێن سۆر

تەپکێن سۆر یێن خوونێ خوارنێ و ئوکسجینی دگەهینە ئەندامێ لەشی و پاشەروکان ژێ وەردگرن. هەر خانەیەك بتنێ 120 رۆژان دژیت لەورا لەشێ مە بەردەوام تەپکێن نوو دروست دکەت

چپکەکا خوونێ پێکدهێت ژ

250 مليون تەپکێن سۆر
270.000 تەپکێن سپی
16 مليون پەرێن خوونێ

پەرێن خوونێ هاریکاریا مەهینا خوونێ دکەن

ریشالێن نیسەك دبێژنێ شریتێن فایبرین

## بوچی دەما تو بریندار دبی خوونا تە نارێژیت ؟

ئەگەر لەشێ تە برینداربوو یان تو کەفتی و سەرێ چوکێ تە شکەست، تۆرەکا ریشالان و پەرێن خوونێ دێ ئێکو دوو گرن و بلەز دێ جهێ برینا تە گرن. خوون ل وی جهی دێ مەهیت و ناهێلیت خوونا تە ب رێژیت. مەهین دێ رەق بیت هەتا دبیتە قەلپیشک.

# بوچی مه چاڤ هەنه ؟



دەمێ تو سەحدكەیە چاڤێن هەڤالەكێ خۆ بتنێ تو ڕەنگێ چاڤێن وی و قەبارێ وان دبینی. كەلەك تشتێن دی یێن دناڤ چاڤی دا هەین لێ تو نابینی. ومرن دا پێكڤە پرسیار بكەین كا ئەو تشت چنە و مفایێ هەر ئێك ژوانا چیە.



مژیلانک ناهێلن کلێش بچیتە دناڤ چاڤی دا

## كی چاڤێن مە د پارێزیت ؟

چاڤێن مروڤی ل سەر هەستیكەكی د ڕاوەستیانە كو چاڤان ژ زیانێن دەرەكی د پارێزیت. هەردیسان چەرمێ پشت چاڤان ژی ڕۆلەكێ گرنگ د گێڕیت بۆ پاراستنا چاڤان.





تەپا چاڤی ب هاریکاریا شەش زەڤلەکان د لڤلڤیت



## كەنگی ڕەشڕەشكا چاڤێن تە مەزن و بچووك دبیت ؟

ڕەشڕەشک ڤالاهیەكا بچووكە. كو كەڤیتە د نیڤەكا بیلبیلكا چاڤیدا. ب ڕێكا ڤێ ڤالاهیێ دچیتە دناڤ چاڤیدا. دەمێ چاڤێن مروڤی ب ڕۆناهیێ دكەڤیت بیلبیاك دێ ڕەق بیت و ڕەشڕەشک ژی دێ ببچوك بیت. لێ هەكە تو چویە د ژورەكا تاریڤە بیلبیلک دێ نەرم بیت و ڕەشرشەشک ژی دێ مەزن بیت.



دەما بیلبیلکا چاڤی نەرم دبیت ڕەشڕەشک مەزنتر لێ دهێت



دەما بیلبیلکا چاڤی ڕەق دبیت ڕەشڕەشک بچوکتر لێ دهێت



## بوچی تەپکا چاڤی یا گروڤرە ؟

شێوێ تەپکا چاڤی کو یا گروڤرە کارتێکرنێ ل سەر دیتنێ دکەت. ئاوێنەیێن چاڤی دڤێت وێنەیەکێ تیژ و دروست ل سەر تۆڕا چاڤی دروست کەن. ئەگەر تەپکا چاڤی کەلەك یا درێژ بیت یان کورت بیت، دڤێت تو بەرچاڤکا بکەیە بەر چاڤێن خۆ.

ئەگەر تو تشتان نێزیکتر ببینی مەرەم ژێ ئەوە رۆناهی ل پێشیا تۆڕا چاڤێن تە ل سەر ئێک کوم دبیت

ئەگەر تو تشتان دوورتر ببینی مەرەم ژێ ئەوە رۆناهیی ب رەخ تۆڕا چاڤێن تەڤە ل سەر ئێک کوم دبیت

ب رەخ تەپکا چاڤی، دەمارا دیتنێ هەیە و پەیامان بۆ مەژی فرێ دکەت کو پەیامێن ویژی وێنەنە

بوچی چاڤێن مە رۆندکان درێژن ؟
رۆندك ژ وێ کونێ دەردکەڤن یا د کەڤیتە کوشا ناڤخویی یا چاڤی و دەما تو د کەیە گری رۆندك چاڤێن تە پاقژ دکەن

## تۆڕا چاڤی یا چەوایە ؟

تۆڕا چاڤی پشتا تەپکا چاڤی د نخێڤیت و دکەڤیتە دکەل وەرگرێن رۆناهیێ. دناڤ ڤێ تۆڕێدا خانەیێن کۆن هەنە کو ل دەمێ رۆناهی یا ب هێز بیت باش کار دکەن و وێنەیێن رەنگاورەنگ د گرن. هەروەسا خانەیێن رود ژێ هەنە کو ل جهێن تاری باش کار دکەن و وێنەیێن رەش و سپی د گرن.

## تو هەمی رەنگان دبینی ؟

هندەك مروڤ یێن هەین نەشێن جوداهیێ بێخنە دناڤبەرا هەمی رەنگان دا، دبێژنە ڤان مروڤان کورەبوییێن رەنگان

# بوچی مە گوهـ هەنە ؟

دەما بەحسا هەستا گوهلێبونێ دهێتە کرن هزر نەکە بتنێ ئەو پارچا گوهی یا ژ دەرڤە ڤی کاری هەمیێ ئەنجام ددەت. گەلەك ئەندامێن دی یێن هەین تو نابینی لێ رۆلەکێ گرنگ هەیە د کریارا گوهلێبونێ دا. هەردیسان ب هاریکاریا هەردوو گوهان ئەم دشێن هەڤسەنگیا لەشێ خۆ ب پارێزین.

کەنالێ نیڤ بازنەی دناڤ گوهێ ناڤخۆیی دا هاریکاریا هەڤسەنگیا لەشێ مروڤی دکەت

گوهێ ناڤەراستێ ژ سێ هەستیکێن بچوك پێک دهێت

پلێن گوهی چ جارا ژ گەشەکرنێ ناراوەستن. لێ گەشەکرنا وێ گەلەکا هێدی و ل سەر خۆیە

شێوێ پلێن گوهی هاریکاریا دەنگان دکەت بچنە دناڤ گوهیدا

تمبلکا گوهی

هەستیکێ چەکوچ

شەمایا گوهی ناهێلیت کلێش و زیندەوەرێن هوور بچنە ژورڤە و دناڤ کەنالێ گوهیدا دهێتە کومکرن.

## بوچی شەما دناڤ گوهێن مەدا هەیە ؟

دناڤ کەنالێن گوهێن مروڤیدا مادەیەکێ وەکی شەمایێ تێدا هەیە. ئەڤ شەمایە ناهێلیت کلێش بچنە دناڤ گوهیدا. هەروەسا دەمێ مروڤ یێ نڤستی بیت و مێریەك بچیتە دناڤ گوهیدا مێری دێ مینە ب شەمایێ ڤە. نێزیکی 4 هزار ڤەرێژێن شەمایێ دناڤ گوهیدا هەنە. پشتی شەما رەق دبیت دەردکەڤیتە ژ دەرڤە.



## چەوا مە گوهـ ل دەنگان دبیت ؟

دەنگێن دوروبەری مە دناڤ هەواییدا هندەك لەرەلەران دروست دكەن. ئەڤ لەرەلەرە تۆمبلكا گوهی د قوتن هەروەكی كا چەوا كەسەك دهولێ د قوتیت. پێلێن دەنگی د گەهنە هەستیكێن گوهێ ناڤەراست و ئەڤ هەستیكەژی دبنە ئەگەرێ لەرزاندنا وی ماددێ شل یێ دناڤ گوهێ ناڤخۆیی دا. موویێن هوور یێن لولوپێچا گوهی لڤینا ڤی ماددێ شل هەلدگرن و ل سەر شێوێ پەیامان بۆ مەژی فرێ دكەت و ل وێرێ دهێنە وەرگێران بۆ دەنگی.

## گوهێ ناڤەڕاستێ

پشتی كەنالێ گوهێ دەرەكی، گوهێ ناڤەڕاستێ دهێت كو پەردا گوهی یا د بێژنێ تۆمبلكا گوهی لێ هەیە.. ئەڤ گوهە ژ سێ هەستیكان پێك دهێت د بێژنێ چەكوچ، دەزگا و ئاوزەنگ.






كوكليا بۆریەكا وەكی لولوپێچانە





## بوچی دەما خۆ ب زڤرینی دێ هەست ب گێژبونێ كەی ؟

گوهـ هاریكاریا مروڤی دكەت هەڤسەنگیا خۆ ب پارێزیت، دەمێ تو خۆ د زڤرینی دێ شلەیێ دناڤ كەنالێن نیڤ بازنەیی یێن گوهیدا زڤریت، هندەك خانەیێن موویان یێن بچوك دێ زانن سەرێ تەیێ د زڤریت لەورا زڤرینا شلەیی دێ وەل تە كەت هەست ب گێژبونێ بكەی.



## گوهێ ناڤخۆیی

پارچا دوماهیێ د بێژنێ گوهێ ناڤخۆیی یا پرە ژ ماددەیەكێ شل كو لولوپیچ ( ئەندامێ گوهلێبونێ ) و هەستەوەرێن هەڤسەنگ كرنێ تێدا هەنە.

# چەوا ئەم بێهنا تشتێن دەوروبەری خۆ د نیاسین ؟

مروڤ پێدڤی ب هندێ یە بەردەوام بێهنا خۆ ب هەلکێشیت داکو ئوکسجینی ب دەستڤە بینیت. ژلایەکێ دیڤە دەمێ تو بێهنا خۆ ب دفنێ هەلدکێشی گەلەک جورێن بێهنێ دهێنە تە. ئەرێ تو چاوا بێهنا وان تشتان دزانی ؟



هندەك موویێن بچوك ل سەرێ کونێن دفنا مروڤی هەنە

## دفن ژچ پێکدهێت ؟

دفنا تە دوو کونێن بچوك یێن هەین کو ب رێکا ناڤبرەکی هاتینە جوداکرن. ئەو موویێن هوور یێن دناڤ دفنێ دا ناهێلن توز و گلێش بچیتە د لەشێ تەدا. لێ گەردیلەیێن وان تشتێن ئەم بێهنا وان دزانین گەلەك ژ توزێ بچوکترن لەورا دچنە د ژورڤە.

دەمێ تو بێهنا خۆ هەلدکێشی گەردیلەیێن بچوك دچنە دناڤ دفنا تەدا

پەیتیا هندەك تشتان گەلەك یا تیرە لەورا دەمێ ئەم خۆ نێزیک دکەین بێهنەکا ب هێز ژێ دهێت وەکی بێهنا پەنیرێ خرابووی.




## چەوا ئەم بێهنا تشتان دزانین ؟

دناڤ دفنێ دا خانەیێن وەرگرێن بێهنێ هەنە. دناڤ دفنێ دا شلەیەك هەیە د بێژنێ میکۆس کو وان کەردیلەیان د حەلینیت یێن دهێنە د ژورڤە لەورا دێ بێهنا وان زانین. دەمێ پەرسیڤ ل تەبیت تو نەشێی ب سانەهی بێهنا تشتان بزانی. هەروەسا برەکا مەزن یا میکۆسیش دێ ژدفنا تە هێتە خوارێ.

## ڕاستە ئەگەر بێهن کەیە تشتەکی دێ تاما ویژی زانی ؟

هەستا بێهنکرنێ و هەستا تامکرنێ پێکڤە کاردکەن. زانا دبێژن کو نێزیکی 80٪ ژ هەستا تامکرنێ ژ بێهنکرنێ د هێتە وەرگرتن. نوکە دفنا خۆ بگرە و تشتەکی بخۆ و پاشی تیبینیا هندێ بکە کا هەمان تام ژێ دهێت دەمێ دفنا تەیا ڤەکری.

## هندەك ڕاستی دەربارەی بێهنکرنێ

- مروڤ دشێت جوداهیێ دناڤبەرا 10 هزار بێهنێن جودا جودا بکەت.
- هەستا بێهنکرنێ ل دەڤ سەیێن پولیسان 1000 جاران ژیا مروڤی ب هێزترە.
- پیسترین بێهن ل جیهانێ ژ کیانەوەرێ بێهنفسکی Skunk دهێت. دەما ئەڤ کیانەوەرە د ترسیت بێهنەکا پیس بەردەت.

بێهنەکا نە خۆش
یا ژڤێرێ دهێت

## کەنگی مروڤ د بێهنژیت ؟

دەمێ تشتەك چوو دفنا تەدا و بۆ تە نەخۆش بوو ئێکسەر دێ بێهنژینا تە هێت داکو ئەو تشتێ چویە دناڤ دفنا تەدا زووکا ب دەرکەڤیت.



# بوچی ئەم د بێهنژین ؟

دەما مروڤ د بێهنژیت ب لەزاتیا 155 کیلومەتر د دەمژمێرەکێدا دندکێن گلێشێ ژ دفنا مروڤی دەردکەڤن.
بێهنژین کریارەکا ڕەنگڤەدانێ یە و مروڤ نەشێت کونترۆلێ ل سەر بکەت. ئانکو بەرسڤدانەکا ئوتوماتیکیە بۆ هاڤێتنا وان تشتێن نەخۆشیێ دگەهینە دفنا مروڤی.

## چەوا پەرسیف د هێتە مروڤی ؟

پەرسیف دبیتە ئەگەرێ هندێ مروڤ بێهنژیت. ژبەرکو ئەو ڤایروسێن پەرسیڤی د ئینە مروڤی دچنە دناڤ دفنێ دا و شەرێ وان خانەیان دکەن یێن کونێن دفنێ نخاڤتین. لێ لەشێ مروڤی بەرگریێ ژ خۆ دکەت ماددێ کلمیشی بەرهەم د ئینیت داکو ڤایروسان بگریت و ب هاڤێژیتە ژدەرڤە.

دەما د بێهنژی کلینسەکێ بدانە بەر دفنا خۆ و پاشی هەرە دەستێن خۆ بشو

## کی بڕیارێ ددەت داکو مروڤ بێهنژیت ؟

دناڤ مێشکێ مروڤیدا سەنتەرەکێ بێهنژینێ هەیە، دەما ڤایروس یان هەر گلێشەک بچیتە دفنا مروڤیدا و نەخۆشیان پەیداکەت، ئەڤ سەنتەرە دێ فەرمانێ ل هندەک زەڤلەکان کەت خۆ ڕەق بکەن و ڤان گلێشان ب هاڤێژنە ژدەرڤە.

نێزیکی 200 جورێن ڤایروسان پەرسیڤی د ئینە مروڤی

## ئایا هەمی مروڤ وەکی ئێک د بێهنژن ؟

دەما تشتەکێ زیانبەخش بچیتە دناڤ لەشێ مروڤیدا دێ بێهنژیت. لێ هندەك مروڤان هەستەوەری بۆ هندەك خوارن و دەرمانان هەیە وەك بهاراتان و تشتێن تیژ لەورا دێ بیهنژن. هەروەسا توڤێ گولان و زیندەوەرێن هوور هەستیاریێ بۆ مروڤی پەیدادکەن.

دەمێ تو د بێهنژیێ هەر چپکەکا کلمیشی یا دەردکەڤیت پتر ژ ملیون ڤایروسان تێدا هەنە. لەورا پەرسیڤا تە بۆ کەسێن دیژی د هێتە ڤەگوهاستن.

## ئەرێ تو ل بەر رۆناهیێ د بێهنژی ؟

هندەم مروڤ یێت هەین دەما ژ نیشکەکێڤە دچنە بەر رۆناهیێ دێ بێهنژن، دبێژنە ڤێ چەندێ بێهنژینا رۆناهیێ. لێ ئەڤ جورێ بێهنژینێ ب شێوێ زکماکی دهێتە ڤەگوهاستن، ئانکو هەکە دەیکوبابێن تە ل بەر رۆناهیێ بێهنژن دبیت تۆژی ب بێهنژی.

# بوچی مه دەڤ هەیە ؟

لەڤەکێ ل سێڤەکێ بدە و بکە د دەڤێ خۆ دا و پاشی ب ددانێن خۆ پاشی پرت پرت بکە. دەڤێ مروڤی دەرگەهێ سیستەمێ هەرسکرنێ یە د لەشیدا. ئەم خوارنێ پێ د خۆین و ئاڤێ پێ ڤەدخوین داکو هەست ب برساتیێ و تێهنیبونێ نەکەین.



نەخێر ئەزمانی پیست نینە، هەورسا ڤەرێژێن خۆهێ و دوهنی و موو ژی ل سەر لێڤان نینن.

ئەرێ لێڤان پیست هەیە ؟

## بوچی ئەزمان د دەڤێ مەدا هەیە ؟

ئەزمانی هندەک زەڤلەک یێن هەین داکو هاریکاریا مروڤی بکەن خوارنێ و ئاڤێ بکەتە د دەڤێ خۆ دا و نەهێلیت ب دەرکەڤیت. هەردیسان ئەزمان هاریکاریا مە دکەت بشێن باخڤین. دەما ئەم تشتێن گەلەک گەرم یان سار بخوین لێڤێن مە ناهێلن دەڤێ مروڤی ب سوژیت.

ئەزمانێ مروڤی ژی زەڤلەک یێن هەین. لەورا ب سانەهی ئەم دشێن ئەزمانێ خو وەربادەین یانژی خوار بکەین.



## مروڤ چەند جورێن تامێن خۆارنێ د نیاسیت ؟



مروڤ دشێت ب سانەهی تاما تشێت شرین، ترش، تەعل و سویر ژێکجودا بکەت. وەرگرێن تامێ دکەڤنە دناڤ ئەزمانی دا و پەیامێ بۆ مەژی فرێ دکەن کا تاما خوارنێ یا چەوایە. مروڤ ژ هەمی گیانەوەرێن دی پتر دشێت گەلەک جورێن خوارنان بخوت. لێ هەر هندەک وەلات هندەک جورێن خوارنێ دخون.








## بوچی خۆارن نامینته د حەفکا مەرا ؟

دەما ددانێن تە خۆارنێ پرت پرت دکەن و دەڤێ تە تفێ ل سەروێ خۆارنێ زێدەکەت. خۆارن دێ هێتە هەرسکرن و وەکی تەپەکا نەرم دێ لێ هێت لەورا خۆارن نامینتە د حەفکا مەرا و ئەم ب سانەهی دشێین ب دائیرین. دەڤێ مروڤی رۆژانە لیترەکا تفێ دروست دکەت.

## مروڤ چەوا تاما خۆارنێ د نیاسیت ؟

ل سەر ئەزمانێ مروڤی نێزیکی 10هزار بشکوژێن تامێ د بەلاڤەنە (هژمارا وان ل دەڤ کەسێن مەزن کێمترن). پەیامێن تامێ دگەل یێن بێهنێ تێکەل دبن و پاشی بۆ مەژی دهێنە فرێکرن و دبێژنە مەژی کا ئەو خۆارن یا خوش بوو یان نە.



## بوچی مە ددان هەنە ؟



ددانێن تە گەلەک کاران ئەنجام ددەن. ئەگەر تە ددان نەبان تو نەدشیای سێڤان بخۆی. ددان هاریکاریا مە دەن خوارنێ لەق ب دەین و پرت پرت بکەین و بجوین داکو ب سانەهی بشێین ب دائیرین. هەردیسان هاریکاریا مە دکەن دروست باخڤین.

### بوچی ددانێن زاروکان د کەڤن ؟

ددانێن سینگی بۆ کەرکرنا خوارنێ دهێنە ب کارئینان. ددانێن سینگی ل دەڤ تە زووکا دکەڤن لەورا ل شوینا وان ڤالاهیەک دیاردبیت و هەڤالێن تە ب تە دکەنە کەنی. لێ ل دویڤدا دوو ددانێن دی ل شوینا وان دهێن.

### کڤ کڤێ ژ دەڤێ خۆ بینە

دەما تە دڤێت کڤ کڤەکێ ژ دەڤێ خۆ بینی دڤێت بزانی کا چەوا دێ لێڤ و ددان و ئەزمانێ خۆ دانیە سەر ئێک. دەما مروڤ پیتا (ف) دبێژیت ددانێن خۆ ل سەر لێڤا خۆ یا بنی د کڤێشیت. ئەرێ تو دێ شێی ب ڤی شێوەی پیتا (ک) بێژی ؟ هههههه گەلەکا ب زەحمەتە.






### چەند جاران ددانێن مروڤی دکەن ؟

د ژیانا هەر مروڤەکیدا دوو دەستێن ددانان بۆ دهێن. ددانێن دەستپێکێ دبێژنێ ددانێن شیری. لێ هێدی هێدی ئەڤ ددانە دکەڤن و ددانێن هەمیشەیی کو ژمارا وان 32نە دهێن و تا دوماهیا ژیانێ دمینن لێ ب مەرجەکی ئەگەر تو رۆژانە بشوی





## کەنگی ددانێن زارووێیان دهێن ؟

کێم زاروو هەنە دەما ژ دایک دبن ددان هەبن. دەما ژیێ زاروکی دگەهیتە شەش هەیڤیێ 20 ددان بۆ دهێن و هەتا ژیێ شەش سالیێ بۆ د مینن و پاشی دکەڤن. ل دووڤدا دەستەکێ نوو یێ ددانان ل شوینا وان بۆ مروڤی دهێن.

پەحنکا دەڤی

ددان

ئەزمان

ئەزمانێ بچوک

گەوری

ئەرێ تو دزانی رەقترین پارچە دناڤ لەشێ مروڤیدا کیشکە ؟

مینا

عاج

دەمار

رها دەماران

## چەوا ئەم خوارنێ د دائیرین ؟

ددان خوارنێ دجوین تاکو مروڤ بشێت ب دائیریت. ئەزمان خوارنێ پالدەت بۆ گەوریێ و ژ وێرێ ژی دچیتە دناڤ گەدەیی دا. دەما ئەم خوارنێ دخوین، ئەزمانەکێ بچوک ل سەرێ بۆریا هەوای هەیە ناهێلیت خوارن بچیتە دناڤ مێلاکێن سور یێن مروڤیدا.

## بوچی ددانێن مروڤی د سپینە ؟

ئەگەر ددانێن تە دپاقژبن رەنگێ وان دێ سپی خویاکەت. چونکی تەخەکا مادێ مینایی ل سەر ددانان هاتیە دانان و رەنگێ وی یێ سروشتی یێ سپیە لەورا ددانێن پاقژ سپی خویا دکەن.

## ددانێن هێرانا خوارنێ

دبێژنە ڤی ددانی ددانێ هێرانێ. زارووێیان هەشت ددانێن هێرانێ هەنە. چوار ل لایێ راستێ و چوار ل لایێ چەپێ. ئەڤ ددانە د کەڤنە لایێ پشتێ یێ دەڤی و بۆ جوین و شکاندن و هێرانا خوارنێ د هێنە ب کارئینان.



## ئەو خۆارنا ئەم دخۆین کیڤە دچیت ؟



دەما تو گوشتی د خۆی نێزیکی رۆژەکێ دناڤ زکێ تەدا د مینیت هەتا دهێتە هەرسکرن. هەرسکرن ئەو کریارە یا خۆارن تێدا دهێتە کەرکرن و هوورکرن داکو تێهن ژێ بهێتە ومرگرتن. لەشێ مە پێدڤی ب تێهنێ هەیە هەتاکو مروڤ بشێت بژیت.

### چەند دەمژمێران خۆارن دمینتە دناڤ زکێ تەدا ؟

دەما تو پارچەکا گوشتی دخۆی دێ چوار دەمژمێران مینتە دناڤ گەدەیی دا و شەش دەمژمێران دناڤ ریڤیکا زراڤ داو نێزیکی حەفت دەمژمێران دناڤ ریڤیکا ستووردا. هەروەسا و حەفت دەمژمێران دناڤ بۆریا دەرهاڤێژتنێ دا یاکو دبێژنێ رێکە .

بۆریا زادی

گەدە

هەول بدە بلا خۆارنا تە ڤێقی و کەسکاتی پتر بیت گوشتی

### سیستەمێ هەرسکرنێ ژ چ پێکدهێت ؟

سیستەمێ هەرسکرنێ بۆریەکا گەلەک درێژە. درێژاهیا وێ دگەهیتە نەهـ میتران. ئەم خۆارن ب دەڤی د خۆین و پاشی ب رێکا گەورێ دچیتە دناڤ بۆریا زادی و تا دگەهیتە گەدەیی. پاشی دێ چیتە ریڤیکا زراڤ هەتا دگەهیتە ریڤیکا ستوور.



ریڤیکا ستوور

### بوچی گەدە خۆارنێ هەرس دکەت لێ خۆ هەرس ناکەت ؟

دیوارێ گەدەیی یێ ژناڤدا گەلەک لێکبادان هەنە و شلەیێ میکوسی درێژت کو هاریکاریا لڤین و بورینا خۆارنێ دکەت. هەروەسا دیوارێ گەدەیی ب خوژی د پارێزیت چونکی گەدە شەربەتەکا گەلەک بهێز درێژیت و خۆارنێ پێ هەرس دکەت.

## ریڤیکا زراڤ

ریڤیکا زراڤ پشتی گەدەیی دهێت و درێژاهیا وێ شەش مەترن. هندەك دەرزیێن هوور وەكی تبلێن دەستان دناڤ دیوارێ ریڤیکا زراڤدا هەنە دبێژنێ ڤیللا. ئەڤ ڤیلایە هاریکاریا ریڤیکان دكەن خۆارنێ بمێژیت.

ریڤیکا زراڤ

## ریڤیکا ستوور

ریڤیکا ستوور پشتی ریڤیکا زراڤ دهێت و درێژاهیا وێ میترەك و نیڤن. ل سەر دیوارێ ڤێ ریڤیکێ ب ملیونەها بەکتریایێن ب مفا هەنە کو هاریکاریا هەسکرنا خۆارنێ دكەن.

ڕێكە

## چەوا خۆارن دناڤ ریڤیکان را دبوریت ؟

دناڤ ریڤیکاندا هندەك زەڤلەك هەنە بەردەوام دهێنە كڤاشتن. ئەڤ كڤاشتنە هاریکاریا خۆارنێ هاریکاریا دكەت دناڤ را بوریت و بچیتە جهەکێ دی.

بەرێ تو بچیە دەست ئاڤێ پیساتی دناڤ بۆریەکا بچوکدا دهێتە هەلگرتن دبێژنێ ڕێكە. پیساتی ئەو پاشمایکێن خۆارنێ نە یێن لەشێ تە نەشیایی هەرس بكەت. لەورا هەردەمێ تو تەنگاڤ بووی زووکا هەرە تەوالێتێ

## چەوا خۆارن دهێتە هەرسکرن ؟

پشتی تو خۆارنێ د خۆی، ژلاینێ ددانانڤە دێ هێتە هوورکرن و پاشی دگەل تفێ دێ هێتە تێکەل کرن هەتا کو وەکی تەپەکا نەرم لێ دهێت، پاشی دێ ڤێ تەپا نەرم ب رێکا گەورینێ دائیری هەتا دگەهیتە بۆریا زادی و دوماهینێ ژی دگەهیتە گەدەیی.



### گەدە دشێت خۆ مەزنتر لێبکەت

دناڤ دیوارێ گەدەیی دا گەلەك لێکبادان هەنە کو هاریکاریا گەدەیی دکەن ژێک بهێتە کێشان و مەزن بیت. گەدە تێرا جهێ چوار لیترێن ئاڤێ دکەت

### دناڤ گەدەیی دا چ ل خۆارنێ دهێت ؟

گەدە شەربەتەکا ترش درێژیت کو دگەل خوارنێ تێکەل دبیت، پاشی زەڤلەکێن گەدەیی دێ هێنە کڤاشتن هەتا خۆارنێ روهن دکەن، پشتی گەدە خۆارنێ هەرس دکەت دبێژنە ڤێ خۆارنێ کریم. پاشی ئەڤ کریمە دێ هێتە هنارتن بۆ ریڤیکان



### ژ گەدەیی بەرەڤ ریڤیکان

پشتی خوارن دناڤ گەدەیی دا وەکی کریمێ لێ دهێت ب رێکا دەرگەهەکێ بچوك دێ دەرکەڤیت و دێ چیتە دناڤ ئێکەم پارچا ریڤیکا زراڤ دا یاکو دبێژنێ دوازدە گرێک.

ڤالاهیا گەدەیی

شەربەتا گەدەیی
ژ ڤێرێ د ڕێژیت

ئەڤ وێنەیە بۆ ناڤخۆیا
گەدەیی هاتیە گرتن

ئەڤ خانەیە
میکوسی دروست دکەن

بۆریا خوونێ

کوشت نێزیکی سێ هەتا چوار دەمژمێران دناڤ گەدەیی دا دمینیت و دەما دهێتە هەرسکرن وەکی ئافکێ لێ دهێت.

## گەدە چەوا دشێت خوارنێ هەرس بکەت ؟

گەدە شەربەتەکا گەلەك ترش ب رێکا هندەك ڤەرێژان د رێژیت کو هژمارا وان ڤەرێژان ژ ملیونان پترە. ئەڤ شەربەتە هندا ب هێزە دشێت هەستیکان هوور بکەت و هەرس بکەت. لەورا ب سانەهی ئەو خوارنا ئەم دخوین دهێتە هەرسکرن.

## بوچی زکێ تە قورقورێ دکەت ؟

ئەگەر تو بۆ ماوەیەکێ درێژ خوارنێ نەخوی و هەست ب برساتیێ بکەی. زکێ تە دێ قوڕ قوڕێ کەت. برەکا بچوك یا شەربەتا گەدەیی و هندەك گاز دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا ڤێ قورقورێ.

دیوارێ گەدەیی
گەلەك لێکبادان هەنە

## بوچی دناڤ لەشێ مەدا مێلاکەکا ڕەش هەیە ؟

مێلاکا ڕەش ل سەرێ زکی هاتیە هەلگرتن، دکەڤیتە ل سەر گەدەیی و ب ڕەخ پەنکریاسێ ڤە. مێلاکا ڕەش مەزنترین ئەندامێ ناڤخویی یا لەشێ مروڤیە و گەلەك خوون یا لێ هەی. ئەرێ تو بێژی کارێ ڤی ئەندامێ مەزن چ بیت ؟

ئەگەر پارچەکا مێلاکا ڕەش هاتە ژێڤەکرن، ئەو دشێت پارچەکا نوو بۆ خۆ دروست بکەت

### بۆچی مێلاکا ڕەشا یا گرنگە ؟

مێلاکا ڕەش و پەنکریاس دوو ئەندامێن گەلەك گرنگن بۆ سیستەمێ هەرسکرنێ. هزریکە مێلاکا ڕەش وەکی کارگەهەکێ یە دەمێ کەرەستە د چنە ژورڤە و دهێنە هەلگرتن هەتا دەمێ خەلک پێدڤی دبیتێ، ب هەما شێوە مێلاکا ڕەش ژی خوارنا زێدەیا یا لەشی هەلدگریت هەتاکو لەش پێدڤی ب خوارنێ دبیت، هەردیسان خوینێ ژی پاقژ دکەت.

مێلاکا ڕەش، توورکێ زراڤ و پەنکریاس شەریەتا خۆ دریژنە ناڤ دوازدە گرێکێ دا

### توورکێ زراڤ

پشتی کو مێلاکا ڕەش ماددێ زراڤی دروست دکەت، ئەڤ زراڤە دناڤ توورکەکیدا دهێتە هەلگرتن، دەما خوارن ژ گەدەیی دچیتە دوازدە گرێکێ، زراڤ دێ چیتە وێرێ و خوارنا دوهنی دێ هەرس کەت.



خوونزڤروك

## پلێن مێلاكا ڕەش

ئەگەر تو باش تەماشەی مێلاكا ڕەش بكەی دێ بینی نێزیكی سەد هزار پلەیان یێن هەین كو شێوێ وان یێ شەش لایە. هەر پلەك ژی ژ گەلەك خانەیان پێكدهێت.



پلێن مێلاكا ڕەش

ئەڤ وێنێ ل سەری یێ پلەیێن مێلاكا ڕەشە كو گەلەك هاتیە مەزنكرن، هەر پلەیەكێ خوینزڤروكەك هەیە دكەڤیتە د نیڤەكا وێدا

## هندەك كارێن گرنگ یێن مێلاكا ڕەش

- هەلگرتنا ڤیتامینان و كەرەستێن كیمیایی
- هاریكاریا هەرسكرنا خۆارنێ دكەت.
- ئەو خوونا ژ ڕیڤیكان بۆ دچیت پاقژ دكەت، لەورا ئەگەر تشتەك ب شاشیڤە مێژابیت ناهێلیت بچیتە دناڤ زڤرۆكا خوونێ دا.
- ڕێژا شەكرێ و دوهنی دناڤ خوونێ دا ڕێك د ئێخیت.
- شەكرا زێدە هەلدگریت هەتا لەش پێدڤی دبیتێ.
- خوونێ پاقژ دكەت و ماددێن ژەهراوی ژناڤدا دەرێخیت

## پەنكریـــاس

پەنكریاس شەربەتەكێ دروست دكەت و د ڕێژتە دناڤ دۆازدە گرێكێ دا و كەرەستێن دوهنی و پرۆتین و كاربوهایدراتان هەرس دكەت. هەروەسا هۆرمونێ ئەنسولینی ژی دروست دكەت كو فرمانێ وی ڕێكخستنا ڕێژا شەكرێ یە دناڤ خوونێ

مێلاكا ڕەش نێزیكی 500 كاران دكەت

## بوچی مە دوو گولچیسک هەنە ؟

گولچیسک جوتەکێ ئەندامێن بچوکن دکەڤنە دناڤ پشتا مروڤیدا ل سەر حەڤزێ. فرمانێ وان یێ سەرەکی پاقژکرن و فیلتەکرنا خوونێ یە ژ ماددێن ژەهراوی، دەما گولچیسک خوونێ پاقژ دکەت کەرەستێن خراب و ئاڤا زێدە ل سەر شێوێ میزێ د هاڤێژیتە ژ دەرڤە.

## کارێ گولچیسکان چیە ؟

هەر جارەکا دلێ تە خۆ د قوتیت، نێزیکی ٪20 ژ خوونا لەشی دچیتە گولچیسکان. گولچیسک ژی دی خوونێ پاقژ کەن و ئەو کەرەستێن لەشی پێدڤی پێ نەبیت دێ هاڤێژیتە ژ دەرڤە. گولچیسک مێزی دروست دکەت و ب رێکا بۆرییێن میزێ بۆ میزلدانکێ فرێ دکەت.





## ئەگەر تە گەلەك ئاڤ ڤەخار دێ چ ل تە هێت ؟

کولچیسک هاریکاریا مە دکەن کونترۆلێ ل سەر رێژا ئاڤێ دناڤ لەشێ خۆ دا بکەین. ئەگەر تە گەلەك ئاڤ ڤەخار کولچیسک دێ ئاڤا زێدە هەمیێ هاڤێژیتە ژ دەرڤە. سەنتەرەکێ تایبەت دناڤ مێشکێ مرۆڤیدا هەیە د زانیت کا گەلەك ئاڤ دناڤ لەشیدا هەیە یان نە.

میز بەردەوام ژ کولچیسکان ب رێکا بۆرییێن میزێ دهێتە هنارتن بۆ میزلدانکێ

کومتلکا بۆرییێن خوونێ

دیوارێ میزلدانکێ ژێک دهێتە کێشان

## بوچی مرۆڤ دچیتە دەست ئاڤا زراڤ ؟

رۆژانە کولچیسکێن تە نێزیکی 180 لیترێن (48 گالون) خوونێ پاقژ دکەت. ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر کولچیسک رۆژانە لیترەك و نیڤێن میزێ دروست بکەت. لەورا مرۆڤ دچیتە دەست ئاڤا زراڤ. خوون بەردەوام دناڤ کولچیسکان را دبوریت داکو بهێتە پاقژکرن.

## چەوا کولچیسک خوونا پیس پاقژ دکەت ؟

دەما بۆریا خوونێ دچیتە دناڤ کولچیسکاندا گەلەك چەق و لق ژێڤەدبن. ئەڤ بۆریە د گەهیتە جهەکی کو ب ملیونەها نیفرۆن لێ هەنە. نیفرۆن بچوکترین یەکەیا پێکهاتنا کولچیسکێ یە و کومەکا بۆرییێن خوونێ وەکی تەپەکێ ل دورماندوری وێ هەنە و کارێ وێ پاقژکرنا خوونا پیسە.

میز ب رێکا ڤێ کونێ ژ ناڤ لەشی دەردکەڤیت



## بوچی پیست لەشێ مە د نخێڤیت ؟

پیست ئەو ئەندامێ مەزنە یێ کو هەمی پارچەیێن لەشێ مروڤی پێکڤە گرێدەت و د نخێڤیت و ژ زیانێن دەرەکی د پارێزیت. پیست تەخەکا شانەیێن زیندییە و فرمانێ وێ یێ سەرەکی پاراستنا ئەندامێن ناڤخویی یێن لەشیە.

ل سەرێ تبلێن مە، شوینتبلا مروڤی ل سەر هەیە و یا چ مروڤان وەکی ئێک نینە



### چەند تەخێن پیستی هەنە ؟

پیستی دوو تەخێن سەرەکی هەنە، تەخا دەرەکی یا تەنکە د بێژنێ توێژ. تەخا ناڤخویی یا ستوورە دبێژنێ بن توێژ. ل بن پیستی تەخەکا دوهنی یا هەی.





ل سەر ناڤبرێن دناڤبەرا تبلاندا نێزیکی 100 هەتا 600 ڤەرێژێن خوهێ هەنە



### بوچی لەشێ مە خوهێ ددەت ؟

دەما تو بکەیە غاردێ لەشێ تە خوهێ دەت، چونکی ل سەر پیستێ تە ملیونەها ڤەرێژێن خوهێ هەنە و کارێ وان دروستکرنا خوهێ یە. خوه گەرماتیێ ژ لەشێ تە دوور دکەت ژبەرکو بورییێن خوونێ یێن دناڤ تەخا بن توێژیدا دێ فرەه بن و گەرماتیێ هاڤێژنە ژدەرڤە و خوه ناهێلیت تە گەرم بیت.









## بوچی پیستێ مە هەردەم یێ گەشە ؟

د هەر دەقیقەکێدا نێزیکی 1000 خانەیێن پیستی یێن مروڤی کو ئەم د بێژینێ قەلپیشک د کەڤن. لێ د هەمان دەمدا پیست دێ هندەك خانەیێن نوو دروست کەت داکو جهێ وان خانەیان بگریت یێن مرین و کەفتین. ژبەر ڤێ چەندێ پیستێ مە هەردەم گەش و جوان خویا دکەت.



ئەڤە وێنێ پیستی یە کو سەد جاران هاتیە مەزنکرن

خانەیێن پیستی یێن مری ل سەر شێوێ قەلپیسکی دکەڤن



## ج دناڤ پیستی دا هەیە ؟

دناڤ پیستێ مروڤیدا ڤەرێژێن خوهێ، ڤەرێژێن دوهنی، دەمار، وەرگرێن هەستان، بستیکێن موویان و بۆریێن خوونێ هەنە.

## ڕاستە بەکتریا ل سەر دەستێن مە دژین ؟

ل سەر پیستێ لەشێ مروڤی ب ملیونەها بەکتریا ل سەر دژین، لێ پتریا ڤان بەکتریان د زیانبەخش نینن. بەلکو ئەو ب خۆ ناهێلن بەکتریایێن زیانبەخش بهێنە سەر پیستێ مە. لێ هەر دەما برینەك ل سەر پیستێ لەشێ مە چێبوو ئەڤ بەکتریایە بۆ خۆ ب دەلیڤە دێ بینن و زیانێ دێ گەهینە ساخلەمیا مە

ل سەر پەحنکا دەستی و بنێ پیان، موو و ڤەرێژێن دوهنی نینن

## بوچی مووو ل سەر لەشێ مە هەنە ؟

ل سەر لەشێ مروڤی ملیونەها داڤێن موویان هەنە و مفایەکێ تایبەت هەیە. مووو ژ خانەیێن مری پێک دهێن و ژ بستیکا موویان گەشە دکەن ئەڤ بستیکە دناڤ چالەکا بچوک ل سەر پیستی هاتیە چکلاندن. هەر داڤەکا مووی بۆ ماوێ چەندین سالان دژیت.







ئەڤە وێنێ داڤەکا پرچێ یە و خانەیێن دورماندوری وێ کەلەك د دیارن

## بوچی موویێن پرچا مروڤی د رەقن ؟

تەخا دەرەکی یا پرچێ ب هندەك خانەیێن ناڤێکداچویی هاتیە نخاڤتن. ئەڤ خانەیە ل دورماندوری کورکەکا بچوك هاتینە دانان و ماددەیەکێ رەق تێدا هەیە د بێژنێ کیراتین کو پرچێ رەق دکەت. نینوکێن مروڤی ژی ژ ماددێ کیراتینی هاتینە دروست کرن لەورا د رەقن.







رشک و سیپهیێن سەری ب هاریکاریا پێن خۆ ب سانەهی دشێنت خۆ ب داڤێن پرچێڤە گرێدەن و هێکان ل بنێ وێ بکەن



## چەوا پرچا مروڤی دبیتە سەرك ؟

هندەك جاران دوماهیا داڤێن پرچا مروڤی شەق دبن. ئەڤ شەقبونە دێ پرچا مروڤی کەتە سەرك. لەورا باشترین رێک ئەوە تو پرچا خۆ ب قوسینی.






## چەوا پرچ د لڤلڤیت ؟

ل بنێ هەر داڤەكا پرچێ یان موویێن ل سەر لەشی مە، زەڤلەكەكا بچوك یا هەی. دەما مروڤی سار دبیت ئەڤ زەڤلەكە پرچێ رِەق و رِاست دكەت. ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر لەشێ مە گەرماتیا خۆ ب پارێزیت.

رۆژانە نێزیكی 80 هەتا 100 داڤێن پرچێ د وەریێن لێ نەترسە چونكی داڤێن نوو ل شوینا وان دهێن





رشكێن سەری رۆژانە نێزیكی 10هێكان دكەن

## پرچێ تە یێ نەرمە یان یێ گۆستیركە ؟

پرچێ هندەك مروڤان یێ رِاستە، یێ هندەكان یێ نەرمە و یێ هندەكێن دی د بیتە گۆستیرك. ئەڤ چەندە ژی پشت بەستنێ دكەتە سەر بستیكا پرچێ. پرچێ رِاست ژ بستیكەكا گروڤر كەشە دكەت. یێ نەرم ژ بستیكەكا هێلكەیی و یێ گۆستیرك ژبستیكەكا پەحن كەشە دكەت.



## بوچی ئەم بێهنا خۆ د هەلکێشین ؟

بێهن هەلکێشان ئێکە ژ پێدڤیێن هەرە سەرەکی یێن ژیانێ و د ماوێ هەر خولەکەکێدا ژ 16 هەتا 20 جاران ئەم بێهنا خۆ د هەلکێشین. ئەم ب رێکا دوو مێلاکێن سۆر کریارا هەناسەدانێ ئەنجام د دەین.

### چەوا هەوا دگەهیتە مێلاکێن سۆر ؟

دەما ئەم بێهنا خۆ د ب رێکا بۆریا هەوای د هەلکێشین، هەوا دێ گەهیتە مێلاکێن سۆر. ل دەستپێکێ بۆریەکا مەزنە و پاشی دهێتە دابەشکرن بۆ دوو بۆریێن بچوک و هەرئێک دچیتە دناڤ مێلاکەکێدا. ل دوماهیا هەر بۆریەکێ کیسکەکێ بچوک هەیە دبێژنێ ئەلڤیۆلا.

### هندەک راستی دەربارەی مێلاکێن سۆر

- ئەو خوونا دچیتە دناڤ مێلاکێن سۆردا یا پرە ژ گازا دوەم ئوکسیدا کاربونی. لێ ئەو خوونا ژێ دەردکەڤیت یا پرە ژ گازا ئوکسجین.
- دماوێ هەر خولەکەکێدا مروڤ ژ 16هەتا 20جاران بێهنا خۆ د هەلکێشیت.
- زارووێن ساڤا و بچوک پتر بێهنا خۆ د هەلکێشن ژ کەسێن مەزن.

### بوچی دەمێ دونیا سار بیت هەلم ژ دەڤێ مە دەردکەڤیت ؟

دەمێ دونیا یا سار بیت و ئەم بێهنا خۆ ب هەلکێشین هەلمەك دێ ژ دەڤێ مە دەرکەڤیت. یان ژێ دەمێ مروڤ پف بکەتە خۆدیکێ دێ هەلم خۆدیکێ گریت و پاشی دێ بیتە ئاڤ. دناڤ لەشێ مروڤیدا یا گەرمە. لەورا ئاڤ دبیتە هەلم و دەما ئەم بێهنا خۆ د هەلکێشین و هوسا هەلم دەردکەڤیت.

ئەلڤیۆلا کیسکەکێ بچوکە و تۆرەکا بۆریێن خوونێ ل دوماندور هەیە لەورا دەمێ تژی هەوا دبیت کریارا لێک گهورینا گازان دناڤبەرا واندا دهێتە ئەنجام دان.

کیسکێ هەوایی

بۆریکێن خوونێ یێن بچوك

## کارێ ئەلڤیۆلان چیە ؟

دەما ئەم بێهنا خۆ د هەلکێشین ئوکسجین ب رێکا ئەلڤیۆلایان دچیتە دناڤ بۆرییێن خوونێ دا. هەردیسان گازا دوەم ئوکسیدا کاربونی یا زیانبەخش ژناڤ بۆرییێن خوونێ دچیتە دناڤ ئەلڤیۆلایاندا و پاشی ب رێکا بۆریا هەوایی یا مەزن دەردکەڤیتە دەرڤەی لەشی.

دناڤ هەردوو میلاکێن سۆردا چەند ئەلڤیۆلا هەنە ؟

نێزیکی 300 ملیون ئەلڤیۆلا هەنە

## چەوا زارووو پەیدادبن ؟

وەختێ هێشتا ئەم د بچوك و زاروویەکێ ساڤا دناڤ خێزانا مەدا پەیدا ببا مە پرسیار ژ دایبابێن خوّ د کر وان ئەڤ زاروویێ ساڤا بوّ مە ژ کیڤە ئینایە. دا بەرسڤا مە دەن و بێژن مە یێ ژ نەخوّشخانێ ئینایی.

ئەرێ ڕاستە زارووێن ساڤا ل نەخوّشخانێ هەنە ؟ یانژی چەوا پەیدادبن ؟






### دایبابێن مە زارووویان دروست دکەن

دناڤ لەشێ دایێ دا هێلینکەك هەیە و هێکەکێ دروست دکەت. لەشێ بابێ ژی خانەیەکا بچوك دروست دکەت د بێژنێ سپێرم. پاشی سپێرم دێ چیتە دناڤ هێکێ دا دێ بنە ئێك. هێدی هێدی دناڤ زکێ دەیکێ دا هێک دێ مەزن بیت هەتا بیتە زاروویەکێ ساڤا

### ل دەستپێکێ چ روودەت ؟

پشتی کو سپێر دچیتە دناڤ هێکێ دا و ئێک دگرن. دماوێ 36 دەمژمێراندا ئەڤ هێکە دێ دەست ب دابەشبونێ کەت.







## بۆریا فالۆبی

پشتی سێ رۆژان، خانەیا تێکەلبووی دێ دابەش بیت و بیتە 16 خانە. ئەڤ تەپا خانەیان دێ دناڤ جوکەکێ را چیت د بێژنێ بۆریا فالۆپی. دوماهیێ دێ گەهیتە ناڤ مالبچوکێ دایێ.



پشتی هێک و سپێرم ئێک دکرن، ئێکسەر دێ دەست ب دابەشبوونێ کەت و وەکی تەپەکا خانەیان دێ لێهێت.



پشتی بورینا 20 حەفتیان دەیک هەست ب لڤینا زارووی د زکێ خۆ دا دکەت



## زێدەبوونا هژمارا خانەیان

خانەیا دەستپێکێ دێ دابەش بیت و بیتە دوو. دوو خانە دێ بنە چوار، چوار دێ بنە هەشت و هەشت دێ بنە شازدە هەتا دوماهیێ دبنە بلیۆنەها خانە و لەشێ زارۆویێ ساڤا ژێ دروست دبیت.







## چەند دەم د بوریت هەتا لەشێ زارووی دروست دبیت ؟

دەمێ تەپەکا خانەیان دگەهتە دناڤ مالبچوکێ دایێ ئێکسەر دێ خۆ ب دیوارێ ویڤە گریدەت. ل ڤی جهی لەشێ زارووی د ماوێ 40 حەفتیاندا دروست بیت.





# پەیدابوونا زارooیەکێ نوی دناڤ خێزانێ دا

ئەم هەمی ژ هێکەکا گەلەك بچوك كو ژ سەرێ دەرزیكێ بچوكترە پێن دروست بوین. ئەڤ هێكا بچوك دناڤ مالبچوكێ دەیكێ دا هیدی هێدی مەزن دبیت تا دبیتە زاروو. ل دەستپێكێ دبێژنە ڤێ هێكێ زایگوت و پشتی هەشت حەفتیان دبێژنێ سۆریلانك.

## حەفتیا چوارێ



دڤی ماوەیدا درێژیا لەشێ سۆریلانك بتنێ 10 ملیمیتەرن (هەر مەترەك = 1000 ملیمەتر). هەردیسان سەرێ وی و دەست پێ هێدی هێدی دروست دبن.





## حەفتیا هەشتێ

پشتی ڤی ماوەیی د بێژنە لەشێ زارووی سۆریلانك. درێژاهیا لەشی وی بتنێ 15 ملیمەترن. هەمی پارچەیێن لەشێ وی دروست دبن. سەروچاڤ و تبلێن دەستان و پێیان پیچەکێ دیار دبن.



## هندەك ڕاستی دەربارەی سۆریلانكی

❖ سۆریلانک دناڤ کیسکەکیدا گەشەدکەت یێ پرە ژ مادەیەکێ رۆهن د بێژنێ شلەیێ ئەمنیوت. ئەڤ شلەیە لەشێ سۆریلانکی د پارێزیت.

❖ لەشێ سۆریلانكی ب ڕێكا بەندكەكێ بچوك ب وەریسكێ مالبچوكیڤە دهێتە گرێدان. سەرەكێ بەندكی یێ ب زكێ سۆریلانكیڤە و سەرێ دی یێ ب بۆریەكا خوونێ یا داینێ ڤە. نوكە سەحكە ناڤكا خۆ شوونوارێن وی وەریسكی پێڤە دیارن.



## حەفتیا دۆازدێ

نوکە درێژاهیا سۆریلانکی گەهشتیە 13 سانتیمەتران. ل ڤێرێ مژیلانک و نینوکێن دەست و پێیان بۆ سۆریلانکی یێن پەیدابوین. هەروەسان دشێت دەڤێ خۆ ڤەکەت و بگریت.

راستە مەژی کوری هەنە ؟
دەمێ هێشتا ئەم د زکێ دەیکا خۆ دا، مە مروڤان ژی وەکی گیانەوەران کوری هەبوو. لێ پشتی حەفتیا هەشتێ ژ کەشەکرنێ ئەڤ کوریە بەرزە دبیت.

## حەفتیا بیستێ

دڤی ماوەیی دا درێژاهیا سۆریلانکی 17 سانتیمەترن. ل ڤێری سۆریلانک دشێت تبلا خۆ ب مێژیت و گوهـ ل دەنگان بیت، هەروەسا ئەو دەنگێ دەیکا خۆ ژی د نیاسیت.



## حەفتیا سیهێ

نوکە درێژاهیا وی دگەهیتە 40 سانتیمەتران و دشێت چاڤێن خۆ ڤەکەت و بگریت. لەشێ وی کەلەکێ نەرم و حولیە و مێلاکێن وی یێن سۆر یێن گەهشتین لەورا یێ بەرهەڤە ژ دەرڤەی لەشێ دەیکا خۆ دا بژیت.

## کەنگی تبلێن سۆریلانکی ژێکڤەدبن ؟

دەمێ هێشتا ژیێ سۆریلانکی 14حەفتی. دەست و پێن وی وەکی یێن مریشکان ماینە پێکڤە و پیست دناڤبەرا تبلێن ویدا هەیە. لێ پشتی هینگێ هێدی هێدی تبلێن وی ژێکڤە دبن.





# کی لەشێ مە ژ نەخۆشیان د پارێزیت !

ل دەوروبەری مە هژمارەکا گەلەک مەزن یا میکرۆبان هەنە و شەرێ مە د کەن. لێ لەشێ مە لەشکەرەکێ ب هێز و چالاك یێ هەی شەرێ ڤان میکرۆبان د کەت. هندەك جاران لەشکرێ مە یێ واستیایە لەورا میکرۆب د شەریدا ب سەردکەڤن و نەخۆشیان د گەهینە مروڤی.



## میکرۆب د چەوانە ؟

دوو جورێن میکرۆبان هەنە ئەوژی بەکتریا و ڤایروس. لەشێ بەکتریایێ خانەیەکا بتنێ یە و یا زیندییە و گەلەك شێوە یێن هەین. ڤایروس دندکەکا گەلەك بچوکە و یا بێ گیانە, لێ هەر دەما هاتە دناڤ لەشێ مەدا ب گیان د کەڤیت و دەست ب خۆ زێدەکرنێ دکەت.



## بەکتریا هەڤالێن مەنە !

گەلەك جورێن بەکتریا بۆ مروڤی ب مفانە چونکی هاریکاریا لەشێ مە د کەن باش خوارنێ هەرس بکەت. هندەك ژی د پیشەسازیا دەرمان و خوارنێ دا دهێنە ب کارئینان.







## بەکتریا ل کیڤە هەنە ؟

بەکتریا ب ئازادی ل هەمی جهان دژین. ل سەر دەست و پێ و ددان و سیستەمێ تەیێ هەرسکرنێ ژی هەنە. ب گشتی بەکتریا نە د زیانبەخشن لێ هژمارەکا کێم یا بەکتریان بۆ مە نەخۆشیان پەیدادکەن ب تایبەت ئەگەر دەمێ ئەم بەرێ خوارنێ دەستێن خۆ باش نەشوین.



## چەوا لەشێ مە خۆ د پارێزیت ؟

لەشێ مە سیستەمێ بەکرینێ هەیە کو بەرەڤانیێ ژ مە دکەت. دناڤ ڤی سیستەمی دا لەشکەرەکێ مەزن یێ تەپکێن سپی یێن خوونێ هەیە کو میکرۆبان دادئیریت. هندەك تەپکێن دی ماددەکێ کیمیایی دروست دکەن د بێژنێ دژەتەن کو میکرۆبان د کوژیت یان گێژ دکەت.

## بوچی ئەم ڤاکسینان د دانین ؟

ڤاکسین میکرۆبەکا مریە یان گێژکریە. دەما دهێتە دناڤ لەشی دا، سیستەمێ بەرگرییێ لەشکەرەکێ مەزن دژی وان دروست دکەت. ئەڤ لەشکەرە هەتا مروڤ د مریت د مینە ساخ. لەورا ئەو میکرۆب ئێدی چ جاران نەوێرن نەخۆشیان بۆ مە پەیدا بکەن.

بتنێ دماوێ 20 خۆلەکاندا بەکتریا دشێت خۆ زێدەبکەت

## ئەو نەخۆشیێن بەکتریا و ڤایروس د ئینە مروڤی

| بەکتریا | ڤایروس |
| --- | --- |
| سووتن | پەرسیڤ |
| ئیشانا گەوریێ | خۆریک |
| ژەهراویبونا خوارنی | سورك |
| هەودانێن مێلاکێن سۆر | تایێن سارِ |
| هەودانێن گوهی | |

هندەك بەکتریان کوریەکا درێژ هەیە بۆ لڤینی ب کاردئینیت

# هندەك ڕاستی ییێن سەیر

لەشێ تە ژ هژمارەکا مەزن یا خانەیێن کەلەك بچوك پێک دهێت، لێ ئەڤ خانەیە هەمی پێکڤە وەکی کارگەهەکێ کار دکەن. نوکە دەم هات تو هندەك ڕاستیێن سەیر دەربارەی لەشێ خۆ بزانی.





3|2 ژ ژیانا مروڤی ب نڤستنێ ڤە دچیت. ب شێوەیەکێ گشتی دەمێ شەڤێ تو یێ نڤستی نێزیکی 45 جاران تو لەشێ خۆ د قولپینی.



دەما تو دەستێ خۆ بکەیە تشتەکی گەرم ئێکسەر دێ پەیام گەهنە وەریسکێ پشتا تە و هەر ئێکسەر دێ بڕیارێ دەت دەستێ خۆ ڤەکێشی. ئەڤەژی د ماوێ کێمتر ژ چرکەکێ دا.

دماوێ هەر خۆلەکەکێدا نێزیکی 50 هزار خانەیێن مری ژ لەشێ مە د کەڤن

زەڤلەك نێزیکی ٪40 ژ کێشا لەشێ مە پێک د ئینن، لێ مەژی بتنێ ٪2 ژ کێشا گشتی یا لەشی پێک د ئینیت.





دەما تو سپێدی ژ خەو هشیاردبی، پیچەکێ تو درێژتری. چونکی ب ڕوژێ کرکرکێن دناڤبەرا بڕبڕێن پشتێ دا ناڤێکدا دچن و ب شەڤێ د زڤرنەڤە سەر ڕەوشا خۆ یا ئاسایی.



د ماوێ شەڤ و ڕۆژەکێدا مروڤ 25 هزار جاران بێهنا خۆ د هەلکێشیت.

نوکە نێزیکی 75% ژ خوونا تە یا د خوونڤرۆکاندا بەرەڤ دلی دچیت .20% یا د خوونبەراندا بەرەڤ ئەندامێن لەشی دچیت و بتنێ 5% یا د بۆریکێن بچوك دا.

پتریا مروڤان دشێن رۆناهیا شەمالکەکێ ب دووراتیا 1.6 کیلومەتران ( 1600 مەتران ) ببینن.

## مێژویەکا کورت دەربارەی لەشێ مروڤی

- ل سالا 420 بەری زاینی. نوژدارێ یونانی هیپوکرات کو د هێتە هژمارتن (بابێ پزیشکێ) د گوت : هندەك تشت ل دەوروبەری مە هەنە نەساخیان دکەهینە مروڤی. بەری هینگی خەلکی هزر دکر نەساخی سزایەکە ژدەڤ خودێ بۆ مروڤێن خراب.
- ل سالا 350 بەری زاینی. فەیلەسوفێ یونانی ئەرستۆتالیسی گوت: دل سەنتەرێ هزرکرن و هەست پێکرنێ یە. لێ نوکە ئەم د زانین کو مێشك سەنتەرێ ڤێ چەندێ یە نەك دل.
- ل سالا 190 زاینی. گەلەك زانایان ڤەکۆلین ل سەر لەشێ مروڤی کرن. گەلەك ژ وانان پێزانینێن نە دروست بەلاڤکرن و هەتا سالا 1500 وان باوەری ب ڤان پێزانینێن نە دروست هەبوو.
- ل سالا 1500 زاینی. نیگارکێشێ ئیتالی لیۆنادرو داڤنشی وێنەیەکێ دروست یێ پێکهاتنا لەشێ مروڤی کێشا.
- ل سالا 1590 زانایان مایکرۆسکوپ داهێنا. ڤێ داهێنانێ شۆرەشەکا مەزن د جیهانا زانستێ پزیشکی دا بەلاڤکر.
- ل سالا 1667 ئێکەم کریارا ڤەگوهاستنا خوونێ هاتە ئەنجامدان، خوون ژ بزنەکێ هاتە وەرگرتن بۆ ئێکا دی.
- ل سالا 1818 ئێکەم کریارا ڤەگوهاستنا خوونێ ژ مروڤەکی بۆ ئێکی دی ب سەرکەفتیانە هاتە ئەنجامدان.
- ل سالا 1895 ئێکەم وێنێ تیشکا ئێکس هاتە گرتن.
- ل سالا 1906 مفایێ ڤیتامینان دناڤ خوارنێ دا هاتە ئاشکەرا کرن.

دلێ مە رۆژانە نێزیکی 100 هزار جاران خۆ د ڤوتیت. هەر گاڤا دلی خۆ نەڤوتا مروڤ دێ مریت.

نینوکێن دەستان زووتر ژ نینوکێن پێیان درێژ دبن

سالانە مروڤەکێ پێگەهشتی نێزیکی 500 کیلۆگرامێن خوارنێ دخوت، لێ زارۆویەکێ نەه سالی سالانە کێمتر ژ 250 کیلوییێن خوارنێ دخوت.

لەشێ مروڤ هند ئاسن یێ تێدا هەی تێرا دروست کرنا بزمارەکێ ب درێژاهیا 2.5 سانتیمەتران دکەت.





# فەرهەنگ

**ئەلڤیولا Alveola**
بچوکترین یەکەیا پێکهاتنا مێلاکێن سۆرە کو تێدا کریارا لێکگهورینا گازان دگەل بۆریکێن خوونێ د هێتە ئەنجام دان.

**شاخۆینبەر Artery**
مەزنترین بۆریا خوونێ یە دناڤ لەشیدا کو خوونا ب ئوکسجین بۆ هەمی پارچەیێن لەشی دبەت.

**بەکتریا Bacteria**
زیندەوەرەکا گەلەك هوورە ل سەر پیستێ لەشێ و ناڤ ریڤیکاندا دژیت لێ ئەم چاڤ نابینین. هندەك بەکتریا ب مفانە و هندەك ژی د زیانبەخشن.

**بۆریکێن خووونێ Capillary**
هندەك بۆریکێن خوونێ یێن گەلەك هوورن و وەکی دەرزیانە. خوارنێ دگەهینە خانەیێن لەشی.

**دووەم ئوکسیدا کاربونی $CO_2$**
گازەکا زیانبەخشە بۆ لەشێ مروڤی لەورا ب رێکا هەناسەدانێ لەشێ مە د هاڤێژتە ژ دەرڤە.

**کورەبوییێن رەنگان Color Blidness**
مەرەم ژێ ئەو کەسن یێن نەشێن جوداهیێ بێخنە دناڤبەرا هندەك رەنگاندا. بۆ نموونە رەنگێ شین یا ژ وانڤە رەنگێ کەسکە.

**کرکرگ Cartilage**
شانەیەکە وەکی هەستیکانە لێ یا نەرم و بهێزە و لەشێ مە د پارێزیت. گەلەك کرکرگ دناڤ لەشێ زارووویاندا هەنە.

**خانە Cell**
بچوکترین یەکەیا پێکهاتنا لەشێ مروڤی یە.

**سیلیا Cilia**
هندەك داڤێن وەکی موویانە و د بچوکن. دناڤ دفنێ دا هەنە و ناهێلن گلێش بچیتە د ژورڤە.

**هەرسکرن Digestion**
کریارا هەرسکرنا خوارنێ یە بۆ هندێ ئەو تێهنا ژ خوارنێ دەردکەڤیت لەشێ مە کارێن خۆ پێ ئەنجام بدەت.

**ترشێ ناڤکی DNA**
شریتەکا ترشێ ناڤکی یە دناڤ ناڤکا خانێ دا هەیە. هندەك پێزانین ل سەر هاتینە تومارکرن و بریارێ دەن کا مروڤ دێ یێ چەوابیت.

**ریڤیکا زراڤ Intestine**
بۆریەکا درێژە دناڤ لەشی دا کو تێدا کریارا هەرسکرنا خوارنێ روودەت.

**گەهـ Joint**
ئەو جهە یێ دوو هەستیك یان پتر پێکڤە دهێنە گرێدان.

**لاستیك Ligament**
شریتەکا گەلەك ب هێزە و ژێلك دهێتە کێشان. ئەڤ شریتە هەستیکان پێکڤە گرێددەت.

**میکوس Mucus**
شلەیەکێ چر و نیسەکە دناڤ دەڤی و دفنێ و گەوریێ و ریڤیکێن زراڤ و ستوور دا دهێتە دروست کرن.

**زەڤلەك Muscle**
جورەکێ شانەیانە دناڤ لەشی دا کو دشێت خۆ خاڤ و رەق بکەت بۆ هندێ ئەم بشێن بهێن و بچین و ب لڤلڤین.













**دەمار Nerve**

کومەکا ڕیشالانە دناڤ هەمی لەشی دا د بەربەلاڤن, ب ڕێکا وان پێزانین ژ جهەکی بۆ ئێکی دی دهێنە ڤەگوهاستن.

**نیرۆن Neuron**

نیرۆن خانەیێن دەمارینە. نێزیکی بلیۆن خانەیێن نیرۆنان مێشکی پێك د ئینن.

**ئەندام Organ**

ئەندام ژ کومەکا شانەیێن وەکهەڤ یان ژێکجودا پێکدهێت بۆ ئەنجام دانا کارەکێ دەست نیشان کری.

**ئوکسجین Oxygen**

گازەکا مفادارە لەشێ مە ب ڕێکا هەناسەدانێ وەردگریت بۆ هندێ بشێت تێهنێ بەرهەم بینیت.

**پلازما Plasma**

دەمێ تەپکێن سۆر و یێن سپی دناڤ خوونێ دا بهێنە ژدەرڤە, بتنێ شلەیەك دێ مینیت د بێژنێ پلازما, نێزیکی 55%ژ خوونێ پلازمایە.

**تۆرا چاڤی Retina**

ئەو تۆرە یا پشتا چاڤی ژ ناڤدا د نخێڤیت.

**تف Saliva**

شلەیەکێ ڕەنگ سپیە دناڤ دەڤی دا دهێتە دروست کرن و هاریکاریا خوارنێ دکەت نەرم بیت داکو مروڤ بشێت دائیریت.

**هەست Sense**

هەست ئەو ئامرازن یێن مروڤ پێ جیهانا دەوروبەری خۆ د نیاسیت. مروڤی پێنج هەست هەنە : دیتن, گوهلێبون, تامکرن, بێهنکرن و دەستکرن.

**وەریسکێ پشتێ Spinal Cord**

وەریسکەکێ دەمارانە ژ مەژی ڤەدبیت و دناڤ بڕبڕێن پشتێ دا درێژ دبیت.

**شلەیێ ساینۆڤی Synovial Fluid**

شلەیەکە هاریکاریا گەهێن دناڤبەرا هەستیکاندا دکەت ب شێوەیەکێ هێدی و نەرم ب لڤلڤن.

**خۆهـ Sweat**

شلەیەکێ تام سێرە ژ وان کونان دەردکەڤیت یێن ل سەر پیستی د بەربەلاڤ, خۆهـ هاریکاریا ڕێکخستنا پلا گەرماتیا لەشێ مروڤی دکەت.

**ژەهك Tendon**

وەریسکەکێ ب هێزە, زەڤلەکان ب هەستیکانڤە گرێدەت.

**شانە Tissue**

کومەکا خانەیێن وەکهەڤە و پێکڤە کار دکەن.

**خوونزڤرۆك Vein**

کومەکا بۆریێن خوونێ یە کو خوونا پری دووەم وکسیدا کاربونی ژ ئەندامێن لەشی وەردگریت و بەرەڤ دلی د ئینیت.

# تاقیکرنا گشتی

1. مروڤ د هێته هژمارتن بونەوەرەکێ :

خشۆك    شیردەر    هشکناڤی

2. بچوکترین یەکەیا پێکهاتنا لەشێ مروڤی کیژکە ؟

خانە    شانە    ئەندام

3. چەند هەستیك دناڤ لەشێ مەدا هەنە ؟

206    205    204

4. مەزنترین بۆریا خوونێ دناڤ لەشی دا کیژکە ؟

شاخۆینبەر    ئەترێەم    ڤێنتریك

5. دناڤ هەردوو میلاکێن سۆردا چەند ئەلڤیۆلا هەنە ؟

250ملیون    300ملیون    400ملیون

6. درێژاهیا کیژ خانەیان دگەهیتە مەترەکێ ؟

خانەیێن زەڤلەکان    خانەیێن دوهنی    خانەیێن دەماران

7. دلێ مروڤی دکەڤیتە کیژ لایێ سینگی ؟

لایێ ڕاستێ    لایێ چەپێ    لایێ سەری

8. زاروویان چەند ددان هەنە ؟

20ددان    25ددان    32ددان

9. کیژ جورێ تەپکێن خوونێ شەرێ نەخۆشیان دکەن ؟

تەپکێن سۆر    تەپکێن سپی    پەرێن خوونێ

10. تۆمبلکا گوهی دکەڤیتە دناڤ کیژ گوهی دا ؟

گوهێ دەرەکی    گوهێ ناڤەڕاستێ    گوهێ ناڤخویی

11. مروڤ دشێت چەند جورێن تامێ بنیاسیت ؟

4 5 6

12. مروڤی چەند هەست هەنە ؟

4 5 6

13. چەند جورێن زەڤلەکان دناڤ لەشێ مەدا هەنە ؟

3 4 5

14. کیژ ڤان مەزنترین ئەنداما ناڤخوییی یا لەشی یە ؟

مێلاکا رەش دل گولچیسک

15. کیژ ڤان زیندەوەران نەخوشیا پەرسیفی بەلاڤ دکەت ؟

بەکتریا ڤایروس مێش

16. ئەزمانێ مروڤی چەند زەڤلەك هەنە ؟

17 16 15

17. روژانە دلێ مە چەند جاران خو د قوتیت ؟

100 هزار جاران 150 هزار جاران 200 هزار جاران

18. هەستیێ ب هاریکاریا چ پێکڤە دهێنە گرێدان ؟

ژەهکان کەهان لاستیکان

19. ڤەرێژا شەمایێ د ناڤ کیژ ئەندامێ لەشێ مەدا هەیە ؟

چاڤان گوهان دەڤی

20. تەپکێن سۆر یێن خوونێ چەند روژان د مینە ساخ ؟

120 روژان 130 روژان 140 روژان



# گەریانەك بۆ ناڤ لەشێ مروڤی



لەشێ مروڤی ژچ پێکدهێت؟
بوچی زەڤلەك دناڤ لەشێ مەدا هەنە؟
چەوا هەستیک پێگڤە دهێنە گرێدان؟
چەوا ئەم هزرا خو دکەین؟
ئەو خوارنا ئەم دخوین کیڤە دچیت؟

بەرسڤا ڤان پرسیاران و گەلەك پرسیارێن دی یێن گرێدایی ب پێکهاتن و فرمانێن لەشێ مروڤی ڤە دێ دڤێ پەرتوکێ دا بینی. ئەڤ بەرسڤە هەمی ب شێوەیەکێ زانستی یێ گەلەك ب سانەهی هاتینە ئامادەکرن بۆ هندێ زاروو بشێت بسانەهی بخوینیت و تێبگەهیت. هەردیسان هژمارەکا مەزن یا وێنەیێن ئەندامێن لەشێ مروڤی هاتینە کێشان بۆ هندێ زاروو بزانیت کا لەشێ وی ژ چ پێکدهێت و چەوا دێ لەشێ خو پارێزیت.

داکو خواندنا ڤێ پەرتوکێ بۆ زاروویان ب سانەهیتر لێ بهێت هژمارەکا ئەکتەرێن کومێدی ب درێژاهیا پەرتوکێ دگەل زارووی دانە و ل هەر جهەکێ تێنەگەهیت، ئەڤ ئەکتەرە ب لڤینێن خو یێن سەرنجراکێش وی بابەتی شروڤەدکەن.

ل دوماهیا پەرتوکێ ژی فەرهەنگەکا پەیڤێن کوردی-ئینگلیزی یێن ناڤێن ئەندامێن لەشێ مروڤی  دگەل تاقیکرنەکا بچوك هاتینە ئامادەکرن بۆ هندێ پشتی زاروو ژ خواندنا پەرتوکێ ب دوماهی دهێت پێزانینێن خو ئەوێن ژ پەرتوکێ وەرگریتن تاقی بکەت.



